# جیهانی موسڵمانەتی دوای

# 11ی سپتێمبەری 2001

نووسین و وەرگێڕانی: ئاسۆ کەریم

هەولێر 2009

**ناوی کتێب: جیهانی موسڵمانەتی دوای 11ی سپتێمبەری 2001**

- نووسین و وەرگێڕانی: ئاسۆ کەریم
- بابەت: هزری ئیسلامی
- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (504)
- تیراژ: (750) دانە
- چاپی یەکەم 2009
- نرخ: (2000) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (43)

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**www.mukiryani.com**
**asokareem@ maktoob.com**
**Tel: 2260311**

# پێرست

ئەم کتێبە، ساڵی 2004، دەزگای رەند بەناوی The Muslim World after 11/9، بڵاوی کردۆتەوە و ئەم نووسەرانە بەشدارییان تێدا کردووە: Anشgel M. Rabasa, Cheryl Bernard, Peter Chalk, C. Christine Fair, Theodore Karasik, Rollie Lal, Ian Lesser, David Thaler. کتێبەکە لە بنەڕەتدا بۆ هێزی ئاسمانیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادەکراوە و لە 500 لاپەرە زێترە. پوختەی ئەم کتێبە بە شێوەی زنجیرە، لە رۆژنامەی (هەولێر)ی خۆشەویستدا، بڵاوکرایەوە.

**ئاسۆ کەریم**

## جیهانی موسڵمانەتی دوای 11ی سپتێمبەری 2001

Angel M. Rabasa

**بەرایی**

لـــە 11ی ســـپتێمبەری 2001-ەوە، ڕووداوو پێـــشهاتەکان بەشـــێوەیەکی دراماتیکی ژینگەی سیاسییان لە جیهانی موسڵمانەتیدا گۆڕیـوە. ئـەم جیهانـە بریتییە لە ناوچەیەکی هەراو و هەمەجۆر کە چەندین وڵاتـی موسـڵماننـشینن بـە نفووس گەورەی لە خۆگرتووە، کە لە ئەفریقیای ڕۆژئاواوە تا باشووری فلیپین درێژ دەبێتەوە، ئەمە سەرباری کۆڕو کۆمەڵەو دیاسپۆرای موسڵمان کە لە هـەر چـوار گۆشـەو کـەناری دنیـادا پـەرت و بڵاوبوونەوتـەوە[1]. وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا- لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی پەلامارە تیرۆریـستییەکانی 11 سپتێمبەردوە، شـەڕی بـەرودوای دژە تیرۆریـزم، لەسـەرکار لادانـی تالیبـان لـە ئەفغانـستان و ڕووخاندنی سەدام حسێن و ڕژێمەکـەی لـە عێراقـدا- بـە قـووڵی کەوتۆتـە نـاو کاروباری دنیای موسڵمانەتی کە تیایدا ئایین، سیاسـەت و کولتوور بەشـێوەیەکی ئاڵۆزو چڕوپڕ تێکهاڵقاون و لەگـەڵ بەرژەوەنـدە جیـۆ- سیاسـییەکانی زلهێزانـدا بەریەك دەکەون.

ئەم کتێبە ئـەو فاکتـەرە بزوێنەرانـە دەداتـە بـەر بـاس و لێکۆڵینـەوە کـە گۆڕانکاریی سیاسی و ئایینییان لە جیهانی موسڵمانەتیدا لێدەکەوێتەوە، نەمازە ڕووە "ئایینییە- سیاسییە"ەکەی ئەم جیهانە کـە پێوەندییـەکان لەگـەڵ خـوادا، شێوە و مانا بە کـرداری سیاسـی و خۆگونجـان دەدەن (Green, 1985)، هـەروا واتاو نێوەڕۆکی ئەو پەرەسـەندنانە سـەبارەت بـە بەرژەوەندییـەکانی ئـەمریکا و ڕۆژئاوا چ دەگەیەنن. ئێمە بەهۆی ئەم لێوەکۆڵینەوە بە ڕووە هـەرە گرینگـەکانی جیهـانی موســڵمانەتی ســەبارەت بــە بەرژەوەنـدە هەنوکەییـەکانی ئـەمریکا دادەچینەوە. هەروا خستنەڕووی ئـەو بۆچـوون و تێڕوانینانـەی کـە لـە دیمانـەی

کارناسان و سەرکردەکانی تردا کۆکراونەتەوە لە سەرانسەری ناوچەکانی جیهانی موسڵمانەتیدا. ئارمانجەکانی ئێمە ئەوانەن: 1- پوختەی ئەو رووداوو سەمت و ئاراستانەی ناو جیهانی موسڵمانەتی کە بە شیمانەی زۆرەوە کار دەکەنە سەر تەناهی و بەرژەوەندەکانی ئەمریکا، بخەینە بەردەست بڕیارسازان، کۆڕ و کۆمەڵەی فرەتری ئاکادیمیك و سیاسی، 2- لە فەسڵەکانی بەرودوادا شیکردنەوەیەکی تێرو تەسەل بخەینە بەرچاو لەگەڵ گرنگیدانێکی تایبەت بە تاك تاکی وڵاتەکان یان ناوچەکان.

ئەم لێوەکۆڵینە، ئەو هۆکارە بزوێنەرانە دەخاتە بەرباس و لێدوان کە لە بواری سیاسی- ئایینیی جیهانی موسڵمانەتیدا گۆڕانکارییان لێدەکەوێتەوە و پاشان لەسەر بنەمای ئەم شیکردنەوەیە، ستراتیجێك یان توخمگەلی ستراتیجێك دابنێین کە یارمەتی چاکردنەوەی ئەو هەلومەرجانە بدا کە سەرەڕۆیی ئایینی و سیاسی و هەڵویست و بۆچوونی ئەنتی- ئەمریکایی بەرهەم دەهێنن. میتۆدۆلۆجی ئێمە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

1- تایپۆلۆجییەك بۆ ئاراستەی ئایدیۆلۆجی لە دەڤەرە جیا- جیاکانی جیهانی موسڵمانەتی، بێنینە کایەوە کە لەسەر هەڵویستی گشتیی شوێنکەوتوانیان لەمەڕ حەفت ئاقار، یان پرسی دیاریکەری سەرەکی دامەزراوە. ئەم میتۆدۆلۆجییە ڕێگەمان پێ دەدا ریزبەندییەکی زۆر وردتری گروپ و کۆڕو کۆمەڵەکان و بەراوردی ناوچەکان بکەین. هەروا دەرفەتی ئەوەشمان پێدەدا کە بەشێوەیەکی سیستماتیك ئەو توێژ و کەرتانە دەستنیشان بکەین کە ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دەکارن زەوینەی هاوبەشیان لەگەڵدا بدۆزنەوە بۆ برەودان بە دیمۆکراسی و سەقامگیری و پشتەوشارکردنەوەی نفووزو کاریگەریی گروپ و کۆمەڵەی سەرڕەق و سەرەڕۆ.
2- قامك لەسەر ئەو درزو کەلێنە بنەڕەتییانە دابنێین کە لەنێوان هێڵگەلی مەزەبی، تایەفی، ئیتنی، ناوچەیی و نەتەوەییدا هەن و ئاخۆ چۆن ئەو درزو کەلێنانە، هەم ئاریشەو گرفت بۆ ئەمریکا دەنێنەوەو هەم هەل و دەرفەت.

3- لەو فاكتەرانە دەكۆڵینەوە كە سەرەڕۆیی ئایینی و زەبروزەنگ بەرهەم دێنن. ئەم شرۆڤەیە، تیشكۆ دەخاتە سەر هەلومەرج، پرۆسە و رووداوە كارەساتهێنەكان كە رادیكالیزمی ئیسلامییان تێدا هاتۆتە گۆڕێ. لە فەسڵەكانی بەرودوادا، ئێمە بەتێری لە كاری ئەو فاكتەرانەو شوێنەواریان دەكۆڵینەوە لەسەر نەشونماكردنی بزاڤگەلی سەرەڕۆ و توندوتیژ لە ناوچە جیا-جیاكانی جیهانی موسڵمانەتیدا.

4- ئێمە ستراتیجگەل و كۆمەڵێ ڕێگەچارەی سیاسی و سەربازی لەبەردەم ئەمریكا دادەنێین بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەكان و قۆزتنەوەی ئەو هەل و دەرفەتانەی بەهۆی هەلومەرجە گۆڕاوەكانی جیهانی موسڵمانەتی هاتوونەتە ئاراوە.

ئەم پوختەیە، گەشتێكی ئاسۆییە بەناو ئەم كتێبەدا. دەسپێكێكە بۆ ناو جیهانی هاوچەرخی موسڵمانەتی، چوارچێوەیەكی شیكارییە بۆ ئەم لێكۆڵینەوەیە، خاڵە سەرەكییەكانی ئەم یان ئەو فەسڵی كتێبەكە چڕو پوخت دەكاتەوە و بەهەڤرا كرۆك، دەرەنجامەكانی باس و راسپاردەكان هەڵدێنجێ. ئەم فەسلانەی جەستەی ئەم راپۆرتە پێكدێنن، ئەم چوارچێوەیە بەسەر دەڤەرەكانی جیهانی موسڵمانەتی پەیڕەو دەكەن: وەكو رۆژهەلاتی ناوەڕاستی عەرەب، مەغریب، توركیا، ئێران، خوارووی ئاسیا، ئاسیای ناوەڕاست، خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا، رۆژئاوای ئەفریقیا، دیاسپورای موسڵمان و تۆڕە پەرت و بلاوەكان لە سەرانسەری جیهاندا.

بنیادی.ناوچەیی ئەم راپۆرتە، لە كاتێكدا ئەوە ساغ دەكاتەوە كە رووداوەكانی دوای 11ی سپتێمبەر كاریان لە پێوەندییەكانی ئەمریكا و سەرجەم ناوچەكانی جیهانی موسڵمانەتی كردووە، لێ ئەم رووداوانە بەشێوەی جیا-جیاش كاریان لە خودی ناوچەكان كردووە. لە سۆنگەی قەوارە و هەمەجۆریی حەشیمەتگەلی موسڵمان، هیچ گفتوگۆیەكی گشتی ناشێ بەتەواوی ئالۆزو پالۆزیی ئاقاری موسڵمانەتی بگرێتەوە. لە سۆنگەی ئەمەوە، ئێمە ئەم كارە بە دەسپێكی هەوڵ و كۆششێك دادەنێین كە بە رەخنە و شیكردنەوەی بەردەوام، پوخت و تێرو تەسەلتر دەبێ.

## هەڕەشە و (تحديات)

ئێمە لێرەدا لەگەڵ سێ هەڕەشە و تەحەددی بۆ سەر بەرژەوەندەکانی ئەمریکا بەردو روو دەبینەوە:

1- هەڕەشەی راستەوخۆی فیزیکی بۆ سەر هاوولات و دامەزراوەی ئەمریکایی.

2- سەقامگیریی دەوڵەتگەلی دۆست.

3- نەشـونمای ئایـدیۆلۆجیای ئـەنتی ئـەمریکایی، ئـەنتی رۆژئـاوایی و ئـەنتی دیموکراسی.

رێگەگرتن لە هەڕەشەی راسـتەوخۆ بۆ سـەر بەرژەوەندەکانی ئـەمریکا، ئارمـانجی شەڕی ئێستای ئەمریکایە دژی تیرۆریزم. لەڕەگـەوە دەرهێنـانی ئەلقاعیـدە و تـۆڕە تیرۆریستییە وابەستەکانی، لە رێزی هەرەپێشەوەی تەناهیی ئەمریکایـە. هاریکـاری ئەمریکا لە شەڕی دژە تیرۆریزم، توخمێکی یەکلاکەرەوەیە لە پێوەندیی ئـەمریکا بـە ولاتانی جیهانی موسڵمانەتی، بەلام تاکە توخمیش نییـە. لـەودیو گرفتـی تیرۆریـزم، پرسی شێوەی ئایندەیی جیهانی موسڵمانەتی هەیە کە داخوا تا چـەند ئـەم جیهانـە جێگەیەکی لەبار و دروستە بۆ بەها و بەرژەوەندەکانی ئەمریکا.

## بەلانس راگرتن لەنێوان دیمۆکراسی و سەقامگیریدا

جێ لەقکردن بە دەوڵەتگەلی دۆسـت، لێ سـتەمکار، کۆمەڵـە تەحەددییـەکی ئالۆز دەنێتەوە: دەوڵەتدارانی قوتابخانەی واقیعی، کە لە بـاری مێژوویـیـەوە ئـەوان سیاسـەتگەلی ئـەمریکایان لـە هەمبـەر جیهـانی موسـڵمانەتیدا بـەڕێوەبردووە، سەقامگیریی رژێمیان، پێ لەسەرووی هەموو شـتێکی ترەوەیـە. لـە پـاش شـەڕی 1991ی کەنداو، ترس و بیم لە دەرەنجامـەکانی نـا-سـەقامگیریی عـیراق وای لـە ئیدارەی ئەمریکا کرد کە جارێ واز لە رووخانی سـەدام حوسـێن بهێنـێ و رێگـەی سەدام بدا یاخیبوونی کوردو شیعەکان تێکبهـارێ. بـۆ دەیـەی دواتـریش، دەبوایـە ئـەمریکا لەگـەڵ دەرەنجامـەکانی ئـەم بڕیـارەی خـۆی، هـەڵبکات. بـەهۆی ئـەم ئەزموونەوە، هەنووکە هەندێ لە بڕیارسازان دەڵێن هەندێ جار دەکـرێ لـە رێگـەی

گـۆڕینی رژێمــەوە لــە دەوڵەتگـەلێکی سـتەمکاری دژمنــدا، باشــتر خزمــەتی بەرژەوەندەکانی ئەمریکا بکرێ. لە هەندێ باردا، پشتەوانیکردن لە گـۆڕینی رژێـم، روون و ئاشکرا کارێکی هەرە پێشەنگە. پرسـیارێکی گـچکە هەیـە، بـۆ نموونـە، زۆربەی ئەلتەرناتیڤەکان بۆ تیۆکراسیی ئێستای ئێـران، لەوانەیـە حکوومــەتێکیان لێبکەوێتەوە کە زۆر باشتر رێز لە مافـە سیاسـییەکانی گـەلی ئێـران و مافـەکانی مرۆڤ بگرێ، کەمتر رێی تێ دەچێ پەرە بە بەرهەمهێنانی چەکی ناوکی بدات، یـان پشتەوانی لە گروپ و کۆمەڵەی تیرۆریستی بکا، زۆرتر بەلای هاوکاری ئـەمریکا و دەوڵەتگەلی دیموکراتی تردا بێت. سیاسەتی پرسگەلی پێوەندیدار بە هەق و حـسێبی "نرخ- قازانج" لە هەر کۆمەڵە کردارێکی ئەمریکادا جێگەی خۆی هەیـە کـە بـۆ هێنانەئارای گۆڕانکاریی دیموکراتی دابرێژرێ.

بـەراوردکردن لــە نێـوان ئـەو گۆڕانکارییانـەی کـە چـاوەڕوان دەکـرێ زێـتر سیستمگەلی سیاسیی دیمـوکراتی و پلورالیـستییان لێبکەوێتــەوە و ئـەوەی کـە دەشـێ رژێمگـەلی داپلۆسـێنەرترو شـەڕانگێزتریان بـەدواوە بـێ، زۆر سـەخت و زەحمەتترە لە باری رژێمگەلی ستەمکاری دۆستدا. ئەمە شرۆڤەیەکی وردی هێزی رێژەیی و ئامانجگەلی درێژخایەنی هێزە سیاسییەکانی گۆڕەپانی گەرەکە.

سیناریۆی هەرە رێك لە بە دیموکراتیزەکردنی دەوڵەتگەلی ستەمکاری دۆستدا وا دەخوازێ، گواستنەوە لە سەرەڕۆیی و ستەمکارییەوە، وێـرای ئـەوەی کـە لــە دەسـپێکدا پــڕ کۆسـپ و بــە ژان و ژوورە، لــە مــەودای دووردا ژینگەیــەکی دیمـوکراتیتر و چـێتر بەرهـەمبێنێ. لـەم تێڕوانینــەوە، جیهـانی دیمـوکراتیکی موسڵمانەتی، یان بە دیموکراتیزەکردن، هەندێ لە هۆکارە بنیادییەکانی سەرەڕۆیی و ئەنتی ئەمریکایی کەم دەکاتەوە یان لا دەبات.

بەهەرحاڵ، برەودان بـە گۆڕانکـاریی سیاسـی لـە دەوڵەتگـەلی سـتەمکاری دۆستدا بە تەواوی لە مەودای نزیکدا نـا-جـێگیری لێدەکەوێتــەوە، بـە تایبـەتی ئەگـەر ئالتـەرناتیڤی سیاسـیی دیمـوکراتی و دامــەزراوەی بـەهێزی کۆمەڵگـەی مەدەنی لە ئارادا نەبن. رووخـانی شـا [مەبەسـت شـای ئێرانـە]، مەسـەلەیەکە

جێگەی هەڵوەستەو بەهۆشهاتنەوەیە. هەقایەتیی راگواستنەوەی دیموکراتیانە لە جەزایردا زۆرینەیەکی "ئینتیخابی" ئیسلامی لێکەوتەوە، لێ لە جیاتی ئەوەی کە وڵات بەرەو سیاسەتێکی هێورو هەمەگرتر ببات، رەقەکاریی سەربازی و یاخیگەرییەکی ئیسلامیی رادیکاڵیی بێ وێنە توندوتیژی بەرهەمهێنا. لە میسر، کە بەردی بناخەیە لە پشتەوانیکردنی نیزامە جیهانییەکەی ئەمریکا لە جیهانی عەرەبیدا، رێوشوێنی ستەمکارانەی حکوومەتی موبارەك، ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی لەو وڵاتەدا ناچار کرد پەنا بۆ کاری ژێرزەمینی و نهێنی، تا رادەیەکی زۆریش بۆ کەناڵی سەرەڕۆ، ببەن و دەرفەت و بوارێکی کەم بۆ هاتنەئارای ئەلتەرناتیڤێکی دیموکرات ماوەتەوە. لە عەرەبستانی سعودی، هەڕەشەی هەرە جیددی بۆ سەر ئەو رژێمە، لەو رادیکاڵە ئایینییانەوە دێ کە دیدێکی پەرگیرانەیان بۆ خودی ئایدیۆلۆجیای رەسمیی هەیە. لە پاکستان، کە شەریکێکی سەرەکی ئەمریکایە لە ستراتیجیی دژە تیرۆردا، کزی و پەرپوتیی حکوومەتی موشەڕەف، ژینگەی لەرزۆکی سیاسیی ئەو وڵاتە بەرەو دارمان و خراپتربوون دەچێ، بێ سەروبەری و هەڵچوونی سیاسی لە پاکستان لەوانەیە لەرادەبەدەر خەتەرناك بێت، چونکە پاکستان خودان چەکی نەوەوییە و شیمانەی ئەوە دێتە گۆڕێ کە ئەو چەکانە بکەونە دەست تیرۆریستان یان رژێمێکی رادیکاڵ.

### شەڕی ئایدیایەکان

ئاسان نییە پێشبینی دەرەنجامەکانی گۆڕینی رژێمێك بکرێ، ئەمەش لەوەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ کە بە دروستی لە نەشوناکردنی ئەو ئایدیۆلۆجیانە نەگەین کە دژایەتی بەرژەوەندی، بەهاو سیاسەتەکانی ئەمریکا دەکەن. لێکدانەوەی رادیکاڵانەو رەقەکارانەی ئیسلام لەبەر چەند هۆیەك کە لەم کتێبەدا شوێنپێیان هەڵدەگرین، لە چەند کۆمەڵگەیەکی موسڵماننشیندا، بەرەوی پەیدا کردووە. ئیسلامگەرا رادیکاڵەکان تۆمەتی لە دین وەرگەڕان دەدەنە پاڵ موسڵمانە لیبراڵەکان. ئەوانە لە ماس میدیاو بواری سیاسیدا شەڕی خۆیان دەکەن، هەندێ

جار ئیسلامگەراکان دەچنە دادگا و بە بیانووی پێشێلکردنی شەریعەتی ئیسلام، دەعوا لەسەر نەیارانی خۆیان قەید دەکەن و دادوەر و قازی کۆنەپارێزی واش دەبیننەوە کە نەیارانیان بۆ گوناهبار بکەن و سزای دیاریکراوی پێشوەختەیان بۆ ببڕنەوە(2). هەندێ جار، هەروەکو لە میسر، ئێران و سوودان روویداوە، روناکبیرە موسڵمانە لیبراڵەکان زیندانیکراون، کوژراون یان ناچارکراون هەڵوەدای ئەوبەری دەریاکان بن [واتە ببنە پەناهەندە لە ئەوروپا].

بەرهەمی ئەو "شەڕە ئایدیا"یەی کە ئەمڕۆ لە سەرانسەری جیهانی موسڵماننشیندا لەئارادایە، وێدەچێ دەرەنجامی گەورەی بۆ سەر بەرژەوەندەکانی ئەمریکا لە ناوچەکەدا هەبێ، لێ بۆ ئەمریکا زۆر سەخت بووە کاریگەریی خۆی بنوێنێ. تەنانەت حکوومەتگەلی دۆستیش کە گەرەکیانە سەبارەت بە پرسگەلی تەناهیی هەرێمایەتی هاوکاری ئەمریکا بکەن، لەبەر هەست و سۆزی ناوخۆی وڵاتەکانیان دەست و پێیان بەستراوە. لە بنەڕەتدا زەحمەتە خەڵکی نا- موسڵمان بکارن کار لە هەست و نەست و سۆزی موسڵمانان بکەن دەربارەی ئایینەکەیان. تەنیا موسڵمانان خۆیان راستوێژییان هەیە لە بەرەنگاربوونەوەی خراپ بەکارهێنانی ئیسلام لە لایەن رادیکاڵەکانەوە. بەهەرحاڵ، هەروەکو پاشان دەبینین، چۆن هەوڵ و تەقەلای موسڵمانە میانڕۆ و هێورەکان، لەبەر فاکتەری جۆراو جۆری سیاسی و دەروونی، شەل و گۆد بووە.

## موسڵمانان و بزاڤگەلی "ئیسلامی"

زۆرجاران، لە وتووێژان لەبارەی ئیسلام، هەردوو زاراوەی " موسڵمان" و "ئیسلامی" لەباتی یەکتر بەکاردەهێنرێن. بەهەرحاڵ، لە شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، جیاوازی گرنگ لەنێوان ئەو دووانەدا هەیە (Denoeux, 2002). موسڵمان ئاماژەیە بۆ واقیعێکی ئایینی و کولتووری، هەرچی ئیسلامییە هێمایە بۆ مەرام و نیازێکی سیاسی. بۆ نموونە، وڵاتێکی موسڵمان، ئەو وڵاتەیە کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی موسڵمان بن، لە کاتێکدا دەوڵەتێکی ئیسلامی، دەوڵەتێکە کە رەوایی خۆی لەسەر ئایینی ئیسلام بنیات بنێ.

بناواخوازی ئیسلامی "فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی" دیاردی بۆ گەڕانەوە بۆ بنەماکانی باوەڕ دەکا، ئیدی لە سۆنگەی ئەمەوە، لە ئایینەکانی تریشدا، شێوەی جیا- جیای فەندەمێنتالیزم هەیە[3]. لەگەڵ ئەوەشدا، **شێنکموتووانی** هەر ئایینێك، تا رادەیەك، دەکرێ وەکو "فەندەمێنتالیست- ئوسوڵی" چاویان لێ بکرێ لە داخوازیی ئەواندا بۆ پێڕەویکردن لە مەبەست و نیازی ئوسوڵیانەی باوەڕەکانیاندا، لەبەرئەوەی بانگەشەی رادیکالە "ئوسولییەکان" بۆ گەڕانەوە بۆ مانای ئەسڵیی ئایین لە راستیدا مۆبالیزەکردنێکی بێ ئومێدانەی مۆدێرنەیە، هەندێ لە کارناسان، زاراوەی دیکە بە باش دەزانن وەکو "زیندووکەرەوەی ئیسلامی" بەگشتی بۆ ئەوانەی وەکو فەندەمێنتالیستی ئیسلامی ئاماژەیان بۆ دەکرێ.

سەرباری ئەوەش، "زیندووکەرەوەی ئیسلامی" و "فەندەمێنتالیستی ئیسلامی" ئاقارێکی هەراوی شوێنکەوتەی ئایینی و لێکدانەوەو راڤەکردن دەگرێتەوە، هەم لە بواری ئایینی و هەم یەکتربڕینی ئایین و سیاسەتدا، کە ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە تیشکۆی دەخاتەسەر. هەندێ لە ئوسولییەکان، تێڕوانینێکی بەسیاسیکراویان بۆ ئیسلام هەیە، هی دیکەشیان هەن بانگەشان دەکەن کە ئەوان هەرگیز بەرنامەیەکی سیاسییان نییە. بە لای هەندێ فوقەهاوە، هەروا بۆ مەبەستی ئەم کارەی ئێمەش، جیاوازی بنەڕەتی لەنێوان ئەوانەی کە ئامانجی سیاسییان هەیە- هەروا بە ئیسلامگەراش ئاماژەیان بۆ دەکرێ- و ئایینی ئیسلام بۆ دەسەڵات وەرگرتن بەکاردێنن، ئەوانەشیان کە جەخت لەسەر بەرفەرمانبوونی ئایینی و تەقواو خواپەرستی تاکەکەسی دەکەنەوە.

## جیاوازی لێکدانەوەی ئایینی لە جیهانی موسڵمانەتیدا

لەبەرئەوەی ئیسلام لەم لێوەکۆڵینەدا، جێگەیەکی گشتی هەیە، ئێمە بە گفتوگۆ لەبارەی دیمەن و ئاقاری ئایینی-سیاسیی جیهانی موسڵمانەتی دەست پێ دەکەین. ئیسلام، دووەم ئایینی گەورەی جیهانە و 1.2 بلیۆن ئەندام و شوێنکەوتەی هەیە یان 5/1ی دانیشتوانی سەرجەم جیهان. (سەیری خشتەی 0-

ا بكە). زۆربەی موسڵمانان لە پشتێنە وڵاتێکدا دەژین کە لە ئەفریقیای ڕۆژئاواوە دەست پێ دەکا تا فلیپینی باشوور. لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا، نەك لە هەموویان، موسڵمانان زۆرینەن. بەهەرحاڵ، دووەم جێگە لە جیهاندا، هیندستانە کە ژمارەیەکی زۆر موسڵمانی تێدا دەژی، کەچی لە دەوڵەتی باڵادەست و زۆرینە هیندۆس دا، موسڵمانان کەمینەن. هەروا کۆڕو کۆمەڵەی موسڵمان لە سەرانسەری دنیاشدا، بە پەرت و بڵاوی هەن بە تایبەتی لە ئەورووپای ڕۆژئاوا، باکوورو باشووری ئەمریکا. ئەمانە دیاسپۆرای موسڵمان-یشیان پێ دەگوترێ کە دەورێکی بنەڕەتییان لە هاتنەئاراو نەشونمای تۆڕو بزاڤگەلی ئیسلامیدا هەیە.

**خشتەی (0-1) ژمارەی مەزەندەکراوی شوێنکەوتووانی ئایینەکان لە سەرانسەری دنیادا (بەملیۆن)**

| ٪ ی سەرجەم 2002 | ٪ ی زیادە 2002-1997 | 2002 | 1997 | ئایین |
|---|---|---|---|---|
| 19.8 | 6.9 | 1.226 | 1.147 | موسڵمان |
| 13.3 | 10.9 | 828 | 747 | هیندۆس |
| 19.1 | 6.1 | 1.185 | 1.118 | خەڵکی تری نا مەسیحیی |
| 17.4 | 3.5 | 1.077 | 1.040 | کاتۆلیك |
| 15.5 | 8.1 | 962 | 890 | مەسیحیی دیکە |
| 14.9 | 2.0 | 925 | 907 | دینسز |

* سەرچاوە: ئینسکلۆپیدیای بەریتانی، 2003.

## خشتەی (0-2) سیماو ئەدگاری سەمت و ئاقارە سەرەکییەکانی ناو جیهانی موسڵمانەتی

| ئەندەمێنتالیی رادیکاڵ | ئەندەمێنتالیی دەقخواز | نەریتخوازان | مۆدێرنیستان | عەلمانیی لیبراڵ | عەلمانیی ستەمکار |
|---|---|---|---|---|---|
| (بۆ نموونە: کروپگەلی جیهادیی سەلەفیی سعودی) | (بۆ نموونە: جەماعەتی تەبلیغ) | (بۆ نموونە: سەمت و تەوژمی باڵادەستی شیعە: حەوزەی نەجەف لە عیراقدا | (بۆ نموونە: محەمەدیە لە ئەندەنوسیا) | (بۆ نموونە: حزبە عەلمانییەکانی تورکیا، ئەندەنوسیا) | (بۆ نموونە: حزبی بەعس) |
| ئەجێندا | | | | | |
| بەشێوەیەکی سەرەکی سیاسییە: مۆبالیزەکردنی ئیسلام بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلی سیاسی. . | بەشێوەیەکی سەرەکی ئایینییە. | دەکرێ لەباری سیاسییەوە چالاک بێ، لێ بەشێوەیەکی سەرەکی، ئەجێنداکەی ئایینی، کۆمەڵایەتی و کولتووریە. | دەکرێ لەباری سیاسییەوە چالاک بێ، لێ ئەجێنداکەی ئایینی، کۆمەڵایەتی، پەروەردەیی و فێرکارییە. | تیشک دەخاتە سەر سیاسەتێکی دیموکراتی و کۆمەڵگەی مەدەنی. | سەمتێکی دەسەڵاتخوازانەی هەیە. |
| ئایدیۆلۆجیا | | | | | |
| لێکدانەوەی "حەرفی"یانەی دەقە پیرۆزەکانی ئیسلام، لێ بەهەندێ ناواخن و مەبەستی سیاسی، جەختکردنەوە لەسەر پابەندبوون بە جیهاد. | لێکدانەوەی "حەرفی"یانەی دەقە پیرۆزەکانی ئیسلام. | تێکەڵکردنی بیروباوەڕی ئیسلامەتی بە بەندوباوی خۆجێی. | گەڕانەوە بۆ بەهایە جەوهەرییەکانی ئیسلام، وا چاویشیان لێ دەکرێ کە لەگەڵ دنیای مۆدێرندا تەبا و لەبارن. | بەهاگەلی دیموکراتیی کۆمەڵایەتی یان دیموکراتیی لیبراڵی، جەوهەری "ئایینی مەدەنی" پێکدێنن. | سەرکردە بەرگی نەتەوەپەرستی، یان سۆسیالیستی یان لە دنیای عەرەبدا، پان-عەرەبیزم لەبەر خۆی دەکا. |

| شەرعییەتی سیاسی | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| شۆرشگێرانەیەو دژی باری ئارایە، دەیەوێ دەوڵەت لەسەر بنەمای شەریعەت دابمەزرێنێ. | لەرووی سیاسییەوە کۆنەپارێزە، جەخت لەسەر لەپێشەوەبوون و باڵاتربوونی شەریعەتی ئیسلامی دەکاتەوە و لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا دەقاودەق لێکیدەداتەوە. | لەرووی سیاسییەوە، سەردەگوازە، پتر جەخت لەسەر لایەنە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی ئیسلام دەکاتەوە تا جەختکردنەوە لەسەر لایەنە سیاسییەکان. سەبارەت بە بەجێگەیاندنی شەریعەتی ئیسلامی، نەرمە. | لەرووی سیاسییەوە سەردەگوازە، تیشک دەخاتە سەر پابەندبوون بە حوکمی قانوون، بڕوای وایە کە شەریعەتی ئیسلامی دەبێ لەگەڵ هەلومەرجی سەردەمدا هەڵبکاو بگونجێ. | پشتی قانوونی عەلمانی و دامەزراوەکان دەگرێ لەچوارچێوە و پێشاژۆی کۆمەڵێکی دیموکرات و سیستەمێکی سیاسیدا. | پشت بە بنیادی ستەمکارانە و داپلۆسینی کۆمەڵگەی مەدەنی، ئیسلامی یان هەر شتێکی تر دەبەستێ. |
| حکوومەت | | | | | |
| دیموکراسی "کوفرێکی ئایینی"یە. شەرعییەتی سیاسی لە خواوەیە. حکوومەت دەبێ بەدەست شارەزایانی ئایینییەوە بێ و تەنیا لەبەرانبەر خوادا بەرپرسیارن. دوو مۆدێل هەیە: مۆدێلی ئێرانی و | شەرعییەتی سیاسی لە خواوەیە. لێ دەکرێ هەندێ توخمی دیموکراتی هەبێ. فەرمانڕەوایی سەرکردە سیاسییەکانیان پێ پەسندە بەراوێژ لەگەڵ دەستەی زانایانی ئیسلامی (عولەما). بەلام | شەرعییەتی سیاسی هەم لە فاکتەرکەلی ئایینی و هەم لە فاکتەرکەلی نا-ئایینی سەرچاوە دەگرێ (بۆ نموونە: خواستی خەڵك). حوکمڕانان پێویستیان بەوە نییە هەموو لایەنەکانی شەریعەتی | شەرعییەتی سیاسی سەرچاوە لە ئیرادەی خەڵك لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتیی ئازادەوە، وەردەگرێ. | شەرعییەتی سیاسی سەرچاوە لە ئیرادەی خەڵك لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتیی ئازادەوە، وەردەگرێ. | شەرعییەتی سیاسی لە ئایدیۆلۆجیای دەوڵەتەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ. حوکمی قانوون بەرفەرمانی دەوڵەت یان بەرژەوەندییەکانی حزبە. |

| مۆدێلی سوننی. هەندێ گروپ هەوڵ بۆ دامەزراندنی خەلیفایەتیکی پان و پۆزی ئیسلامی دەدەن. | دەبێ حوکمڕان شەریعەتی ئیسلامی جێبەجێ بکا. | ئیسلامەتی جێبەجێ بکەن، لێ دەبێ ڕێز لە بەها سەردکییەکانی ئیسلام بگرن. | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| سانەکانی مرۆڤ | | | | | |
| چەمکی ڕۆژئاوایی بۆ مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی تاك ڕەتدەکاتەوە. بڕوای وایە کە تەواو بەجێگەیاندنی شەریعەت، کۆمەڵگەیەکی دادپەروەرانەی لێدەکەوێتەوە. نکوڵی لە مافەکانی کەمە ئایینییەکانی تر و ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵ تێڕوانینی ئەواندا نین، دەکا. | تا رادەیەکی زۆر وەك ئەوەی پێشووە، لێ باری ئارای ئەهلی (الزمه) و کۆمەڵەی نا موسڵمانی تر دەپارێزێ. | بەشێوەیەکی دروست ئەو کەرەنتییانەی ئیسلام ڕاڤە دەکا کە بۆ مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی دابینکردووە. لەگەڵ خەڵکی نا موسڵمان لێبووردەیە، هەندێکیان بڕوایان وایە کە هەموو هاووڵاتیان لەبەرانبەر قانووندا وەکیەکن. | ئیسلام چەمکە بنەڕەتییەکانی مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی تاکی تێدایە. لەگەڵ خەڵکی نا موسڵمان لێبووردەیە، هەندێکیان بڕوایان وایە کە هەموو هاووڵاتیان لەبەرانبەر قانووندا وەکیەکن. | مافە مەدەنی و سیاسییەکانی تاك بەرتریان بەسەر دەوڵەت و بەرژەوەندی کۆڕو کۆمەڵەکانەوە هەیە. بڕوای وایە کە هەموو هاووڵاتیان لەبەرانبەر قانووندا وەکیەکن. | بڕوای وایە کە دەوڵەت و حزب و بەرژەوەندییە دەستە جەمعییەکان لەپێش مافەکانی تاکەوەن. |
| ئەجێندای کۆمەڵایەتی | | | | | |
| بەکشتی کۆنەپەرستن. بەزەبری هێزو زۆر دەیەوێ | کۆنەپەرست، بەتایبەتی سەبارەت بە جلوبەرگ و | کۆنەپارێز، لێ هەندێ بەهای نائایینی لە پەروەردەو | بەکشتی پێشکەوتوانەن. بەهای نا ئایینی لە پەروەردەدا | لە پەروەردە و فێرکردن و مافەکانی ژناندا پێشکەوتنخوان. | ناجۆرن، لەهەندێ باردا، عەلمانییە ستەمکارەکان پشتەوانی لە |

| چەمکگەلی ئیسلامی جل لەبەرکردن و ڕەوتار بەسەر کۆمەڵگەدا جێبەجێ بکا. بەهەرحاڵ، هەندێ کەرت و توێژی ئوسوڵیەتی نوێ ڕێگە بە جۆرە سەرکردایەتییەکی ژنان دەدەن. | کۆدەکانی ڕەوتاری ژنان. ئەمە پیاوانیش دەکرێتەوە بەس بە سنوورێکی بەرتەسکتر. | فێرکردندا جێی خۆیان کردۆتەوە. ژنان دەبێ جلوبەرکی ماقوڵ لەبەر بکەن، بەڵام بەشێوەیەك کە لەگەڵ دابونەریتی خۆجێی گونجاو بێ. زۆرینە دژی ئەوەن کە بەزەبری هێز جلوبەرگ و کۆدەکانی ڕەوتار بێنە جێبەجێ کردن. | جێی خۆیان کردۆتەوە. بروایان بەوە نییە کە ئایینی ئیسلام دەخوازێ ئافرەتان جلوبەرکێکی تایبەتی لەبەر بکەن. پشتەوانی لە خوێندن و پێشکەوتنی ئافرەتان دەکەن. | هیچ کۆت و بەندێك لەسەر جلوبەرکی ئافرەتان و کۆدەکانی ڕەوتار نییە ئەگەر قانوون بخوازێ. | خوێندن و فێربوون و هاتنەکۆڕێی ژنان دەکەن. لێ ڕێگە لە کۆمەڵگە ئەدەنی دەکرن و دایدەپلۆسن. |
|---|---|---|---|---|---|
| پێوەندی بە تیرۆریزم | | | | | |
| ڕاستەوخۆیە. زۆربەی گروپە تیرۆریستەکان دەکەونە ناو چوارچێوەی ئەم جۆرەیانەوە. | بەکشتی ناڕاستەوخۆیە. لێ لە زۆر ئاستدا لینك لەنێوان هەندێ گروپی ئوسوڵی و سەردرۆیاندا هەیە. | وەك شتێکی باو نییانە. زۆرینەیان دژایەتی تیرۆریزم و توندوتیژی دەکەن. | وەك شتێکی باو نییانە. زۆرینەیان دژایەتی تیرۆریزم و توندوتیژی دەکەن. | وەك شتێکی باو نییانە. دژایەتی تیرۆریزم و توندوتیژی دەکەن. | دەکرێ تیرۆریزم ببێتە ئامرازێکی سیاسەتی دەوڵەت. هەندێ گروپ هاوپەیمانێتیەکی هەلپەرستانەیان پێ باشە لەگەڵ تیرۆریستگەلی ئیسلامیدا. |
| مەیل و خولیای توندوتیژی | | | | | |
| بەرز | بەپێی هەلومەرج | نزم | نزم | نزم | بەرز |

موسـڵمانانی جیهان تێکەڵە و هەمـەجۆرن، ئـەوان نـەك هـەر تـەنیا لـەباری تێڕوانین و دیدی ئایینییەوە جیاوازییان لەنێواندا هەیە، بەڵکە لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتیشەوە. ئەم راسـتییە فیکـرو ئەندێـشەی ئـەوان لەمـەڕ حکوومـەت، مافەکانی مرۆڤ، ئەجێندای کۆمەڵایەتی (بەتایبەتی مافەکانی ژنـان، نـاوەڕۆکی پـەروەردەو پێگەیانـدن و خوێنـدن)، رایەڵکـەو پێوەنـدیی بـە کـۆڕو کۆمەڵـەی تیرۆریـستیی نێودەوڵەتی و خولیای توندوتیژی دەگرێتەوە. رووکـارە ناسـراوەکانی ئاراستەو تەوژمـە سـەرەکییەکانی ئیـسلام لـە خـشتەی ژمـارە (0-2) پوخـت کراودنەتەوە[4].

هەمان ئەو ئاراستەو تەوژمانە لـە شـەبەنگی دیموکراسـی بـۆ نـا- دیموکراسـی (شێوەی 0-1) و لە شەبەنگی ناتوندوتیژ بۆ توندوتیژ جێگەیان بۆ کراوەتەوە (شێوەی 0-2). پێوەری توندوتیژی دوو توخم دەگرێتەوە: ئـارەزووی ئـەو گروپگەلـە بـۆ 1- تێوگلان لە تیرۆریزم یان شێوەکانی تری توندوتیژی دژ بە کەسـان و موڵـك و مـاڵی خەڵك یان 2- پاکانەکردن یان چاوپۆشین لە زەبروزەنگێکی ئاوایی. پێناسەی ئێمە بۆ دیموکراسی بە تەنیا پرۆسەگەلی شـکڵیانەی هەڵبـژاردنی حکوومـەت نییـە، بەڵکـە بریتیشە لە ئازادیی رادەربڕین، ئازادیی کۆبوونەوە و ئاین و دادوەرییەکی سەربەخۆ- بەکورتی، ژێرخانی پرۆسـەگەلێکی دیموکراتیی سیاسی.

Figure O.1
Muslim Tendencies on a Spectrum of Democracy to Nondemocracy



**Figure O.2**
**Muslim Tendencies on a Spectrum of Nonviolence to Violence**



Figure O.1—continued



Figure O.2—



Nonviolence
Violence
Politico-Religious Spectrum
Traditionalists
Party of the Islamic Revival of Tajikstan
The Nigerian Ulama
Nahdlatul Ulama (Indonesia)
Islamist Modernists
PAS-Pan-Malay Islamic Party (Malaysia)
Prosperous Justice Party (Indonesia)
Liberal Modernists
al-Wasat (Egypt)
Muhammadiyah (Indonesia)
Izala (Nigeria)
Secularist Spectrum
Liberal Secularists
Kuwait National Democratic Movement
PDI-P Indonesian Democratic Party-Struggle
Golkar post-Suharto (Indonesia)
Authoritarian Secular
Al-Fatah (Palestinian territories)
Ba'ath parties of Iraq and Syria
Central Asian ruling parties

ئەو كۆڕ و كۆمەڵ و بزاڤانەی لە هەردوو شێوەی (0-1 و 0-2) دانراون، سەرچاوەیان لە ئاراستەو بۆچوونی سەركردایەتییەكانیان و جەماوەری شوێنكەوتوویان، وەرگرتووە. بەهەرحاڵ، سەبارەت بە هەر كۆمەڵ و گروپێك كە ناوی لێرە هاتبێ، كەمینەیەكی ئەو گروپە، سەرەكەی تری شەبەنگەكەی گرتووە. بۆ نموونە، زۆرینەی هەرە زۆری شوێنكەوتووانی بزووتنەوەی "جەماعەتی تەبلیغ"ی جیهانی بێ زەڕ و نا- توندوتیژن، هەرچەندە ژمارەیەكی ئێكجار كەمی بزووتنەوەكە دابوویانە پاڵ میلیشیای تاڵیبان و بڕوایەكی واش هەیە كە كەناڵێكی ئەندام پەیداكردن بووبن بۆ گروپگەلی تیرۆریستی.

وەك چاوەڕوان دەكرێ، ئەو ئاراستە و تەوژمانەی هاوڕێن لەگەڵ میانڕەویی ئایینی سەروكارێكی زۆرتریان لەگەڵ دیموكراسیدا هەیەو دیسان كەمتر خولیاو مەیلی توندوتیژییان هەیە. بەپێچەوانەوە، ئوسوڵییە رادیكاڵەكان، هەم ئەنتی دیموكراتن و هەم رەقەكارو توندوتیژ. جیاوازی سەرەكیی لەنێوان ئەم دوو سەرەی شەبەنگەكە ئەوەیە كە هەندێ كۆڕو كۆمەڵەی ئوسوڵی، لە كاتێكدا لە باری ئایدیۆلۆجییەوە رادیكاڵن، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە لە میتۆدو شێوازی كاركردندا ناتوندوتیژ بن. ئیدی ئا ئاوا، هەردوو سەرەكە بەیەكەوە سەرجەم ئاراستەو خولیای تەوژمەكانیان گرتووەو ئاستی ئەو هەڕەشەیەی كە ئەوان لەباری سیاسی و دیدی تەناهییەوە دەشێ بیكەن.

فەندەمێنتالیستە رادیكاڵەكان و عەلمانییەكان هەردوو سەری شەبەنگەكەیان گرتووە، تەوژمگەلی میانڕۆی موسڵمانەتیش لەنێوان هەردووكیان دان. پوختەی قسە، پۆلی عەلمانی ناكەوێتە ناو زنجیرەی ئایینی- سیاسییەوە، چونكە فەلسەفەی سیاسیی عەلمانی نێوەڕۆكێكی ئایینی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، عەلمانییەكان نوێنەرایەتی تەوژمێكی گرنگ دەكەن لە زۆر وڵاتی زۆرینە- موسڵماننشیندا هەر ئەمەش وایان لێ دەكات نوێنەرایەتی ئاقارێكی فرەوانی بیرورای سیاسی لە جیهانی موسڵمانەتیدا بكەن.

هەروا، دەبێ تێبینی ئەوەش بكرێ كە ناكرێ سوك و سانا ناو لە هەندێ بزاڤی ئیسلامی بندرێ رادیكاڵ یان میانڕۆ، بەڵكە دەبینین رووكارو ئەدگاری

هەردووکیان هەیە. چونکە هەردوو لابالّی رادیکالّ و میانڕۆ لەنێو هەمان بزاڤـدا بەیەکەوە دەژین، یان ئایدیۆلۆجیای بزاڤەکە یـان سـەرکردایەتی بـە تێپـەڕبوونی کات دەکرێ وەکو خـۆی نـەمێنێ و بجـولّێ. بزاڤگـەلی سـەرەڕۆ دەکـرێ ببێتـە بزاڤێکی میانڕۆ و بەپێچەوانەشەوە هەر راستە. بۆ نموونە، ئیخوانولموسـلمین، لـە سەردەمی هـەرەزووی هاتنـە مەیدانـدا، تۆمـارێکی میلیـشیایی، پیلانگێـڕی، غافلّکوژی هەبوو، لە کەرتی غەززەو کەناری رۆژئاوادا، حەماس-ی هەلّێنا. لـە لایەکی دیکەوە، ئیخوانەکان لـە چـەند وڵاتێکـی عەرەبیـدا بوونەتـە بزاڤگـەلی گـەورەی ناتوندوتیـژ (بـەلاّم هێـشتا لـە بـاری سیاسـییەوە رادیکـالّن). لـەدوا پەرەسەندندا، ئیخوانەکانی میسر، پشتەوانی پالّێوراوێکی مەسیحی (قیبتی)یان کرد بۆ پەرلەمانی میسری کە تا ئێستا هەنگاوی وا بەبیری هـیچ رێکخراوێکـی موسلّمانی ئوسولّی دانەهاتووە. "الجماعـة الاسـلامية المصرية" لـە پرۆسـەیەکی گواستنەوە دایە لە رێکخراوێکی تیرۆریـستییەوە بـۆ گروپێکـی کـاری سیاسـی، هەروەکو بالّێکی جەماعـەتی ئیـسلامی لـە خـوارووی رۆژهـەلاّتی ئاسـیا بـەم ئاقارەدا هاتووە. پەرەسـەندنی شـیاوی لەمبابەتـەی گـروپ و کـۆڕو کۆمەلّـەی رادیکالّی ئیسلامی، ئەو پرسە گرنگ و سەرنجڕاکێشە دێنێتە پێشەوە کە چۆن لە پێڤاژۆی پرۆسەی بنیاتنانی دامـەزراوەی دیموکراتیـدا، دەکـرێ یـان دەشـێ ئـەم گروپانە خۆیان بگونجێنن و بسازێن.

### جیاوازی نێوان ئوسولّییەکان

ئوسولّییەکان، هەروەکو تێبینی کراوە، بە تایبـەتی لێکدانـەوەی خۆیـان بـۆ ئیسلام لەسـەر دەقـە پیرۆزەکـانی ئیـسلام: قورئـان و سـوننەت بنیـات دەنـێن «سوننەت: ئەو نموونە مۆراڵییەی پێغەمبەر محەمـەد (د.خ) پێـشکەشی کـردووە وەك لـە فەرموودەکانیـدا تۆمـار کـراوە، تۆمـاری فـەرموودەو کردەوەکـانی». شیعەکان، ترادیسیۆن و بەندوباوی ئیمامەکانی خۆشیان خستۆتە پـالّ قورئـان و سوننەتەوە. بەگشتی ئوسولّییەکان پشتیوانی بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنی تەواوی

شەریعەتی ئیسلامی دەکەن. هەروا لێکدانەوەی قانوونیش دەبێ پشت بە ترادیسیۆن و بەندووباوی شەریعەتی بالأدەست ببەستێ.

ئوسولییە ئیسلامگەراکان، لە هەولّی پتەوکردن و بەهێزکردنی ئۆمەتی ئیسلامی دان لە جیاتی بەهێزکردنی ئەم یان ئەو دەولّەت. ناسیۆنالیزم، بە دەمارگیریی دەزانرێ کە بە عەلمانیەتی رۆژئاوایی ژەهراوی بووەو جێگەی دلّسۆزی و پابەندبوون بە خودای گرتۆتەوە. ئەم چەمکەی یەکیەتیی باوەڕ تایبەت نییە بە ئایینی ئیسلام. لە ئەورووپای رۆژئاوادا، چەمکی مەسیحیایەتی، Res Publica Christina ی بیرمەندە مەسیحییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، چەمکێکی بێ سەروبەر بوو لە تیوریی سیاسیی ئەورووپیدا پێش ئەوەی یەکیەتیی کلێسای رۆژئاوایی لە لایەن چاکسازی و سەرهەلّدانی دەولّەتگەلی- نەتەوەیی لە سەدەی شازدەمدا بێتەئاراوە. جیاوازی پراکتیکی ئەوەیە: هیچ یەکێك نەبووە گرنگی و سەنگێکی سیاسی هەبووبێ لە رۆژئاوا بە جیددی باسی لە یەکیەتی مەسیحیایەتی بۆ چەندین سەدە کردبێ. لەکاتێکدا ئومەی ئیسلامی بەردەوام دەنگ و سەداو ئاوازێکی قوولّی لە جیهانی موسلّمانەتیدا هەبووەو هەیە[5].

بەکردەوە، ئوسولّییەکان، وەکو زۆربەی موسلّمانان، زەحمەتێکی ئەوتۆ ناکێشن لە سازان و خۆگونجاندن لەگەلّ دەولّەتگەلی نەتەوەییدا کە هەنوکە جیهانی موسلّماننشینیان لێ پێکدێ. وێرای ئەوەی کە ئوسولّییەکان هەلّویستی جیا- جیایان لە بەرانبەر دەسەلاّتی سیاسیدا هەیە. ئوسولّییە رادیکالّەکان، دەیانەوێ ببنە میلیشیای ئایینی و سیاسی و رەخنەی توند لە عولەمایان دەگرن و پێیانوایە ئەوانە خۆیان بە دەسەلاّت فرۆشتووە. ئوسولییە دەقخوازەکان، زێتر بەکاری تیۆلۆجی و پرسی مۆرالّی و رەوتاری تاکەکەسییەوە خەریکن تا کاری سیاسەت، خۆ لەچوونە ناو سیاسەت و سەرجەم کۆمەلّگەش بە دوور دەگرن[6]. لە زۆر ولاّتدا، ئوسولّییەکان، لەناو ئەو دەزگا ئایینییانەی دەولّەت پشتیان دەگرێ و کۆمەکیان دەکا، گۆشەو میحرابێکیان دەستکەوتووەو بەرانگاری ئەو دەزگا سیاسییانە نابنەوە کە ستاتۆ و داهاتێکی بۆ دابین کردوون. زۆرێك لەو بزاڤانە بە تەواوی خۆیان سازاندووە.

هەندێکیان ڕەنگدانەوەی ئەو نموونە بەربڵاوەی بێباکی سیاسییە ئیسلامییەن کە لەگەڵ ترادیسیۆنی دیموکراتی و لیبرالیدا دەگونجێ (Metcalf, 2000).

### سەلەفییەکان و وەهابییەکان

بزاڤگەلی ئوسولّی «(لە سەلەفی صالح —ەوە هاتووەو ئاماژە بۆ هەردوو نەوەی یەکەمی ئیسلام دەکا)»، کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا سەریانهەڵداوە، دەیانەوێ وەلامی تەحەددییە سەربازی، کولتووری و سیاسییەکانی رۆژئاوا بدەنەوە. سەلەفییەکان گەرەکیانە ئیسلام «پاکژ» بکەنەوە بەهۆی گەڕانەوە بۆ ئەو شێوە پوخت و ناگەندەڵەی ئیسلام کە بڕوایان وایە لە سەردەمی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) و یارانیدا بەرێوەبردراوە. لەسەرانسەری جیهانی موسڵمانەتیدا، بزاڤی سەلەفی هەن. هەندێکیان ئەجێندایەکی تەواو ئایینی و نا- سیاسییان هەیە. هەندێکی تریشیان خزاونەتە ناو تەوژمی نوێی ئیسلامەتی، یان کاریان لێ دەکەن. هی واشیان هەن بوونەتە پشت و پەنای کۆڕو کۆمەڵی تیرۆریست و توندوتیژ.

سەلەفییەکان، بە کۆنەپارێزیی پەڕگیر دەناسرێنەوەو جەخت لەسەر خۆنیشاندانی ڕواڵەتکارانەی خواپەرستی دەکەنەوە: ریش بەردانەوە، پۆشینی جلوبەرگی ئیسلامی و لێکهەڵاواردنی نێرو مێ بنیات دەنێن «(ژن و پیاو)». سەلەفییەکان هەوڵ بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی تر لەوەی هەیە دەدەن، بەڵام هەر لەرێگەی سیاسەتگەلی نەریتخوازانەوە نا. تەکفیرو هیجرە، لە خۆنیشاندانە پەڕگیرەکانی سەلەفیزم-ە. شوێنکەوتووانی ئەم گروپە ویستیان ئوسامە بن لادن بکوژن، چونکە پێیانوابوو ئوسامە نەرم و سازشکارو خۆگر نییە[7]. وەهابییەکان لەنێو ئەم پۆلەدان (هەرچەندە وەهابیزم 150 ساڵ بەر لە بزاڤی سەلەفیی مۆدێرن هەبووە). ناوی وەهابیزم لە ناوی دامەزرێنەرەکەیەوە هاتووە: محەمەد ئیبن عەبدولوەهاب. ئەم پیاوە چاکسازێکی ئایینی سەدەی هەژدەهەم بووە لە نەجد کە دەکەوێتە ناوەڕاستی عەرەبستانی سعودییە. لەراستیدا، وەهابییەکان خۆیان ئەم زاراوەیە بەقێزەون دەزانن و زاراوەی

«الموحدون» یان «اهل التوحید» بەچاکتر دەزانن، واتە «ئەوانـەی دان بـە تـاك و تەنیایی خوادا دەنێن ». لە رێگەی ئەم زاراوانەوە، وەهابییەکان پێیانوایە بەتەنیا ئەوان بانگەشە بۆ تەوحید، تاك و تەنیایی خوا، کە پرەنسیپی بنەڕەتی ئیسلامە، دەکـەن (Algar, 2002). وەهابییـەکان، چـەمکگەلی خۆیـان هەیـە: هیجـرەت (راکردن لە ترادیسیۆنی غەیرە وەهابی)، تەکفیر (بەخوانەناس دانانی موسڵمانانی دی)، جیهادی چەکدارانە، نەك هەر بـە ئـەرکێکی رێگەپێـدراو دەزانـن، بەڵکـە بەئـەرکێکی پابەنـدکار دژی خوانـەناس و موسـڵمانی نـا وەهـابی کـە مـۆری «موشریك» و بتپەرستیان بەنێوچەوانەوە دەنێن[8].

وەهابیزم، نفووزو کاریگەریی خۆی بۆ ئەو هەڤالبەندییە سیاسی و کەسـایەتییە دەگێڕێتەوە کە ئیبن عەبـدولوەهاب لەگـەڵ محەمـەد ئـیبن سـعود -ی فـەرمانڕەوای «درعیە» لە نەجد کردبووی. ئیبن سعود پشتەوانی خۆی بۆ عەبـدولوەهاب دەربـڕی کە جیهاد دژی هەموو ئەوانە بکا کە لە رێبازی وەهابی لایانـداوە، لـە بەرانبـەردا عەبدولوەهاب لەباری ئایینییەوە پاکانە بۆ شاڵاوە سەربازییەکانی ئیبن سعود بکـاو بەڕاستیان بزانێ. لەگەڵ ئەوەشدا، وەهابیزم وەکـو رێـچکەو ئاراسـتەو سـەمتێکی پەراوێزکەوتەو هەرتەقەو لەڕێ لادەری ناو ئیسلام چاوی لێ دەکرا تـا ئـەو دەمـەی عەبدولعەزیز ئیبن سعود توانی هاشمییەکان لە حیجاز، واتە ئەو ناوچەیەی کە شـارە پیرۆزەکانی مەککەو مەدینەی لێیە، بکاتە دەرەوە و لە سـاڵی 1932دا شانـشینی عەرەبستانی سعودی پێکبهێنێ. ئێستا دەوڵەتی نوێی سعودی، تووشی رەوشـێکی گرژو دژوار بووە، لـەنێوان ئایـدیۆلۆجیای رەسمیـی، کـە خـۆی لـە رێـچکە تونـدو پەڕگیرەکانی خۆی بـەری ناکـا، و نێـوان پێداویـستییە ئـابووری و تەناهییـەکانی، دەوڵەت دۆش داماوە کە 50 ساڵە سعودیە وەکو هاوپـەیمانێکی لـەبار، سـەروکاری لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیـە. لـە 11ی سـپتێمبەری 2001-ەوە، ناسازی و نالەباری تیوری و پراکتیکیـی سـعودیە، ناسـازی پێوەنـدیی ئـەمریکاو سعودیە، ناکرێ بەهەند وەرنەگیرێن.

وەهابیزم، ئوسوڵییەتێکی بەبنەچەکە خێڵەکییە. بزاڤگەلی ئوسولّی دیکە، بزاوت و چالاکی سیاسیی بەرفرەتریان هەیە. ئەو ئوسوڵییەتە نوێیەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە میسر سەریهەڵدا، باوەڕو ئاقیدەی ئایینیی ئوسولّی لەگەڵ هەندێ ئاکارو خەسڵەتی بزاڤگەلی فاشیستی تێکەڵکرد، لەوانە سوکایەتیکردن لەبابەتی «دارمانی رۆژئاوا، ئەنتی-سامیبوون»[9]، ئارەزووی هێنانەدی کۆمەڵگەیەکی ئایینی و ئیتنیی «پاك و بێگەرد»ی نموونەیی، دیسپلینی توند، رۆڵی ناوەندی و سەرەکی سەرکردەو رابەری کاریزمایی، بەرنامەی سیاسیی شۆرشگێرانە. ئوسوڵییە نوێیەکان رەگ و ریشەیان لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا کە ئەوانی بەرهەمهێناوەو پێگەیاندووە، هەیە نەك لەناو گوندو دێهاتی کۆنەپارێزو نەریتخوازو دەڤەری دێهاتنشین. ئەوانە رووی دەمیان لەو خەڵکانەیە کە لە ژینگەی نەریتیی خۆیان هەڵقەنیون و هاتوونەتە ناو ژینگەیەکی غەوارەو نادیار و کەس بەکەس نەبوو، واتە خەڵکی ناو شارە لە تەنەکە دروستکراوەکانی جیهانی موسڵماننشین و رۆژئاوا. هەروا رووی دەمیان لەو کەسانەشە کە ئاستێکی باڵای خوێندنیان تەواوکردووە، لەوانە دەرچووی کۆلیجەکانی ئەندازیاری و پەیمانگاکانی تەکنەلۆجی[10].

رێکخراوی هەرە رەسەنی ئوسوڵییەتی نوێ، ئیخوانولموسلمینی میسرە، کە ساڵی 1928، حەسەن ئەلبەننا دایمەزراند. واتە چوار ساڵ دوای هەڵوەشانەوەی خەلافەت لە لایەن مستەفا کەمال-ەوە. لەسایەی خەلافەتدا، ژیانی ئایینی و سیاسیی موسڵمانان بەناو یەکگرتووانە بوو. ئیخوانەکانی میسر، نموونەی سەرمەشق بوون بۆ رێکخراوگەلی هاوشێوەی خۆیان لە وڵاتانی ترداو، ستراکتورو بنیادێکی رێکخراوەیی ئاڵۆزیان دامەزراند کە هەر کەرت و توێژێکی جیاوازی کۆمەڵایەتی (قوتابیان، کرێکاران، خاوەن پیشەکان) و وەزیفەگەلێکی وەك (پرۆپاگندە، پێوەندی بە جیهانی موسڵمانەتی، دارایی، پرسەکانی شەریعەت) بەش و رێکخراوی خۆیان هەیە. تەبای بزاڤگەلی فاشیستی ئەوروپایی، لاباڵی سەربازی لە بابەتی «کراس رەشەکانی مۆسۆلینی»، ئیخوانەکانیش، گروپێکی

چەکداریی نهێنییان هەبوو بەناوی «جیهازی سری». لە دیسێمبەری 1948دا، ئیخوانەکان، سەرۆك وەزیرانی میسر، نیقراشی پاشا-یان تیرۆرکرد، دوو مانگ دواتر، وەك تۆڵەساندنەوە، کرێگرتەکانی حکوومەتی میسر، حەسەن ئەلبەننایان لەجێ کوشتەوە.

ئەمرۆ، ئیخوانولموسلمین، لە هەموو ولاتانی عەرەب و لە هەندێ ولاتی غەیرە عەرەبیشدا، لقی خۆی هەیە. ئیخوان، چ بە قانوونی بێ چ بەنهێنی بەهێزترین رێکخراوی ئیسلامییە لە چەند ولاتێکی وەك: میسر، ئەردەن و کوێت. تاکتیك و ستراتیجی ئەم رێکخراوە وەك جاری جاران نەماوەو فرەوان بووە. هەندێ لقی ئیخوان، سەریان لەکاری توندوتیژی دەخورێ و لە هەندێ ولاتیشدا، بۆ نموونە لە ئەردەن، تا رادەیەك بوونەتە بەشێکی خواسایی پرۆسەی سیاسی. لەگەڵ ئەوەشدا، دوا ئامانجی ئەوان هەروەکو خۆی ماوەتەوە کە برێتییە لە هێنانەدی تێڕوانینی خۆیان بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لەو ولاتانەی کاریان تێدا دەکەن[11].

پاش حەسەن ئەلبەننا، کەسی هەرە دیارو بەنێوبانگ کە دەورێکی لە پەرەدان بە ئوسولییەت و ئوسولییەتی نوێ هەبووبێ، ئایدیۆلۆجیستی میسری، سەیید قوتب بووە. وەختێك سەیید قوتب لە زینداندا بووەو دواتر حکوومەتی ناسر لە سێدارەی دا، کتێبە هەرە بەناوبانگەکەی "معالم في الطريق"ی نووسیوە، کە لە لێکدانەوە چەند بەرگیەکەی "في ظلال القرآن" هەڵێنجدراوە. سەیید قوتب پێیوابوو، کۆمەڵگەی موسڵمانەتی لە جاهلیەتدا دەژی، واتە ئەو رەوشەی بەر لە "بعثة"ی محەمەد لە نیمچە دورگەی عەرەب باو بووە[12]، سەیید قوتب بەپێچەوانەی رێبازی بەرە-بەرەی ئەلبەننا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی لە میسر، بڕوای بە دەسەلات گرتنە دەست هەبووە لەرێگەی پێشەنگێکی شۆرشگێرانەوە کە لە سەرێ ڕا کۆمەڵگە بە ئیسلام بکاتەوە. حوکمڕانان، موسڵمان بن یان نا، ئەگەر بوونە کۆسپ لەبەردەم ئەم ئەرکەدا، ئەوا پاساوی لەسەرکارلادانیان بەهەموو دەستاوێژێك لە ئارادایە. پاش مردنی سەیید قوتب، نووسینەکانی بوونە بەشێك لە کانوونی ئیسلامی سیاسی رادیکاڵ. رێبەری هەرە بالای ئێران، ئایەتوڵڵا عەلی خامنەئی، کتێبەکانی سەیید

قوتبی بۆ فارسی وەرگێـراون (Erikson, 2002). هێڵێکـی پەرەسـەندن لـە سـەیید قوتـب-ەوە، بـۆ ئەلقاعیـدە هەیـە لـە ڕێگـەی ئەیمـەن زەواهـیری، کـە قوتـابی ڕێنوێنییەکانی سەیید قوتب و ڕابەری ڕێکخراوی ئـەلجیهادە کـە لـە سـاڵی 1998دا لەگەڵ ئەلقاعیدە یەکیگرتووە.

Giles Kepel لـە شـیکاری ڕەتکردنـەوەی کولتـوورو ئایـدیای ڕۆژئـاوایی لەلایەن ئیـسلامییەکانی میـسرەوە، ئامـاژە بـۆ چـوار پـۆلی ڕەتکـراوە دەکـا: جووەکان، خاچپەرستەکان، کۆمۆنیست و عەلمانییـەکان و (Kepel, 1985) [13].

زاراوەی خاچپەرست لە بنەڕەتدا بۆ قیبتییەکانی میسر بەکار دەهێنـدرا، لێ لـەم ساڵانەی دواییـدا، ئیـسلامییە ڕادیکاڵـەکان ئـەم زاراوەیـان بەگـشتی کـردووەو مەبەستیشیـان بە شەیتان لەقەڵەمدانی بوون و ئامادەیی ڕۆژئاوایـە لـە جیهـانی موسڵمانەتیدا. کۆمۆنیستەکانیش بە دوژمنـی خـوا دادەنـرێن. عەلمانییـەکان، بەوانە دەگوترێ کە وەك موسڵمان هاتوونەتە دنیا، بەڵام لە دین وەرگـەڕاون و لەسەرینی ئەمەوە سزای ئەوان، مردنە. هیچ کام لەو گروپانە لـە دیـدی ئـەو ئیسلامییە ڕادیکاڵانەوە، جێگەیەکیان لـەم دنیایـە بـۆ نامێنێتـەوە. هـەروا ڕادیکاڵەکان هیچ گوێ بـە بەنـدوباو و ترادیـسیۆنی لێبـوردەیی موسـڵمانان نادەن سەبارەت بە خەڵکی غەیرە- موسڵمان کە لە ناوچە موسڵماننـشینەکان [دار الاسلام]دا دەژین و پێیان دەگـوترێ "الـذمي"[14] هـەروەکو لـە پـەلاماری دڕندانە بۆ سەر قیبتییەکانی میسر و دیانەکانی پاکستان و بـەزۆر ڕاگواسـتن لـە ناوچەکانی پێکداداندا لە ئەندەنوسیا دەردەکەوێ.

نوسـولێیە ڕادیکاڵـەکان، دیمۆکراسـی وەکـو ئایدیۆلۆجیایـەکی بێگانـان، ڕەتدەکەنەوە- واتە پێیان ئایینێکی ئیلحادییە. دەنگدانیان پـێ لـە پرۆسـەکانی هەڵبژاردندا، بیدعەیە. ئیسلامیش بیدعەی حەرام کـردووە. چـونکە ئیـسلام بـە تێڕوانینی ئەوان، تاکە شێوەیەکی حوکمڕانیی دەخاتە ڕوو کە ئـەویش خەلافـەتی ئیسلامی و دامەزراوەکانی خەلافەتە.

هەندێ گروپ، وەکو حزبی تەحریر-ی جیهانی، بانگەشە بۆ دامەزراندنەوەی خەلافەت دەکەن. ستراتیجیی هەرێمایەتی ئەم گروپانە لە هەندێ رووەوە لێکدی جیان. حزبی تەحریر بانگەشەی ئەوە دەکا کە جیهادی ئاشتیخوازانەی پێ باشە. واتە بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لە رێگەی بڕواپێهێنان و گفتوگۆوە نەك زەبروزەنگ بەکارهێنان. لێ ئەوانەی دەڵێن کە ئەمە هەڕەشەیەك دەگرێتە خۆ، ئاماژە بۆ دوو خاڵ دەکەن: بنیادی کادیر لەو رێکخراوەدا خەسڵەتی بزاڤگەلی پەڕگیرانەی هەیە: حەماسەتی زیاد لە پێویست. حکوومەتان، هەڵویستی جیا-جیایان لەمبارەوە هەیەو زۆرێکیشیان بڕیاری قەدەخەکردنی حزبی تەحریریان داوە. ئەم رێکخراوە لە ئاسیای ناوەراست، هەروا لە میسریش، قەدەخەیەو هەر کەسێ بڵاوکراوەی ئەم حزبەی پێ بگیرێ و بڵاوبکاتەوە، سزای زیندانی بۆ دەبڕێتەوە. لەوەش گرنگتر، پاش چەند ساڵ چاوەدێری، ئەلمانیا لە ساڵی 2003دا ئەم رێکخراوەی قەدەخەکرد، وەزیری ناوخۆی ئەلمانیا ئۆتۆ شیلی دەڵێ لە بڕیاری دادگای ئەلمانیا دا هاتووە: ئەم رێکخراوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسییەکانی خۆی، پەنا بۆ بەکارهێنانی زەبروزەنگ دەباو دەیەوێ کاری توندوتیژ بکا[15].

## ئەندامگیریی رادیکالانە

سەرکەوتنی گروپە تیرۆریست و رادیکاڵەکان دەگەڕێتەوە بۆ تەکنیکە پەرەسەندوو ئاڵۆزو پاڵۆزەکانی خەڵك وەرگرتن لە ریزەکانی خۆیاندا. توێژە بە ئارمانجکراوەکان، سەرچاوەی پەنهانی لێکجیای ئەندام لێ وەرگرتنن. هەر توێژێك، شێوازی جودای ئەندام لێ وەرگرتن و پێوەری رەوتارو مامەڵەی خۆی گەرەکە. شێوازی بنەڕەتی ئەندام پەیداکردن، بریتییە لە مزگەوت، سەنتەری کولتووری، قوتابخانە، زانکۆ، رێکخراوی گەنجان، رێکخراوی تەندروستی و خۆشگوزەرانی بە رێکخراوە خێرخوازەکانیشەوە، سازمانگەلی کۆمەڵایەتیی تر. لە توێژێك بۆ توێژێکی تر، میتۆدۆلۆجی ئەندام وەرگرتن دەگۆڕێ. بۆ نموونە، لە زانکۆکان، جیایە لەوەی کە لە ناوچە پەراوێزکراوە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان

پێــڕەو دەکــرێ. ئەنــدام وەرگــرتن لــەناو ئەمانــەی دوایــی، وەکــو hittiste-ەی جەزایری[16]، لەوانەیە حەزی چوونە ناو گروپگەلی تیرۆریستی، لەبەر وەڕس بوون و نائومێدی و قورتاربوون لەو شێوە ژیانە بێ.

بەپێی سەرچاوەیەکی کوێتی، هەندێ لە ئیخوانەکان، یان گروپی سەلەفی بـە خۆنزیك کردنەوە لــە کــوڕو کــچە گــەنجی 12 و 13 ســاڵی دەســت پــێ دەکــەن. هەرزەکارێکی بەتەمەنتر، خۆی دەکاتــە دۆســت و برادەریــان و بهــەڤرا وەرزش و چالاکی گەنجانەی دیکە دەکەن. ئــەو هــەرزەکارە بەتەمــەنترە، داوایــان لێ دەکــا دوای کلاس و وانە خوێندن، بەیەکەوە لە مزگەوت بــە جەماعــەت نوێــژ بکــەن. پاشان وانەو دنیــابینی ئیــسلامیان فێردەکــاو هەقایــەتی بەســۆزو فرمێــسکرێژو بەترسی دوای مردن و ڕۆژی سەلا ‹‹ڕۆژی لێپرسینەوەو هەق و حیــساب››یــان بــۆ دەگێڕێتەوە. وەختێکی ئەو کوڕانە بالق دەبن، فێریان دەکەن کە حەرامە ردێــن و سمێڵی خۆیان بتاشن. ئیدی بەچەند ساڵێکی کەم، دەبنە سۆزداری تەواوو، ئامادە دەبن بۆ خزمەتکردن بە دۆزی ئیسلام، کاری توندوتیژیش ئەنجام بدەن و تەنانــەت هەنــدێکیان وایــان لێ دێ بڕیــاری ئــەوە بــدەن ئیخوانــەکان، یــان ڕاوێــژکارە سەلەفییەکەی، ئیسلامی تەواو نین و دەچــنە ریــزی گروپــی تیرۆریــستی دیکــەی توندوتیژترەوە. چاودێرێکی تر دەڵــێ: خزمایــەتی وەکــو میکــانیزمێکی ئەنــدام پەیداکردن ســودی لێ وەرگــیراوە. چــاودێرێکی ســێیەمیش پێیوایــە بــۆ ئەنــدام پەیداکردن لە ریزی هەرزەکاراندا چەند قۆناخێك هەیە: هاندانی خەڵك بــۆ نوێــژی بەجەماعەت و تەکنیکی کاری بەکۆمەڵ (کۆکردنەوەی پــارە بــۆ جێبــەجێکردنی پێداویستی ئەم یان ئەو تاکە کەس) وەکو میکانیزمێك بۆ پێوەندیکردنی خــەڵك پێیانەوە، پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری جڤاکی، قەناعەت هێنــان بەخــەڵك بــۆ بوونــە ئەنــدامێکی چــالاك و هەڵــسوڕاوی گــروپ. وەك ســەرنج دەدرێ، ئــەم تەکنیکانە زۆر تا کەم پێوەندییان بە سیاسەتەوە هەیە. ئەم تەکنیکانــە، فــشاری لەملان خۆش، دنەدانی ئابووری، دەسگرتنی گەنجی بێ ئومێــدی وەڕســبوو، بــێ کارو بێ بەندوباری کۆمەڵایەتی دەگرنەخۆ[17].

## ئوسوڵیيەت و توندوتیژی

دەنگدان و داتاو زانیاری تر، وەکو ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لەو وڵاتانەی هەڵبژاردنی بەماناو راست و دروستیان تێدا کراوە، نیشان دەدەن کە گروپێکی کەم لەناو ئوسوڵییە موسڵمانەکان، پشتیوانی گروپگەلی تیرۆریست و توندوتیژ دەکەن. ئەو ژمارە ناجۆرەی تیرۆریستان، یان پەرگیرە رەقەکارەکان لەناو کۆڕو ژینگەی ئوسوڵییە نوێیەکان/ ئوسوڵییە رادیکاڵەکانەوە هاتوون. ئەمە بۆ وایە؟ جوت بوونی ئوسوڵییە رادیکاڵەکان و توندوتیژی لەوەوە دێ کە هەندێ لەو گروپانە، جیهادی بەچەک-یان بردۆتە ریزی هەر (5) کۆڵەکەکەی ئایین: شەهادەتهێنان، 5 فەرزە نوێژکردن، بەرۆژووبوون، حەجکردن یان چوونە ماڵی خودا لە مەککە. (محەمەد فەرەج-ی ئایدیۆلۆجیستی ئەلجیهاد، کتێبێکی بەناوی «الجهاد: الفریضة الغائبة» نووسیوە، کە تیایدا جەخت لەسەر جیهاد وەکو ئەرکی تاکە کەس دەکاتەوە و ئەو راڤەی جیهاد، بە رووبەرووبوونەوەی توندوتیژانەی دوژمن، دەکا).

وشەی جیهاد لە قورئاندا، بە مانای جەنگ بەکارنەهاتووە، بەڵکە بۆ ئاماژەکردن بە خەباتی ناوەکی (دەروونی) تاکەکەس بەکارهاتووە. رێبازی جیهاد لە سەدەی یەکەمی ئیسلامدا وەك خەباتێکی سەربازی هێنرایە گۆڕێ بۆ رەواییدان بە بەرفراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامی. لە کاتێکدا دەسپێشکەری لە پەنابردن بۆ هێز پاساو نادرێتەوە. چونکە جیهاد مەرج و شەرتی خۆی هەیە. فەقیهەکانی سەردەمی هەرەزووی عەبباسی (لە ئاخیرو ئۆخری سەدەی هەشتەم و سەرەتای سەدەی نۆیەمی زایین) باسیان لە دوو چەمکی جیهادی بەچەك کردووە: شەڕ بۆ دیفاعکردن لە خۆ و بڵاوکردنەوەی باوەڕی ئیسلامی. ئەو شێوەی دوایی جیهاد بەکۆمەڵ لە لایەن ئوممەوە بەرپا دەکرێ. ئوممەش، وەکو جەستەیەك، دەبێ لەژێر سایەی حوکمڕانێکی شەرعی- خەلیفە بێت لە ترادیسیۆنی ئەهلی سوننەدا. لێ مادام خەلیفە نەماوە، یان ئوممە سەرۆکێکی دانپیانراوی نییە، ئەم شێوە جیهادە چیدیکە مومکن نییە بەرپا بکرێ. ئیدی لە گوتاری نوێی

ئیسلامیدا گرنگی زیتر، بەشێوەی جیهاد بۆ دیفاع لە خۆکردن دەدرێ[18]. لەباری تیورییەوە، دەبێ جیهادی دیفاع لەخۆکردن، شەڕێك بێت بۆ پاراستنی موسڵمانان لە دەستدرێژیکاران و دەبێ لە شەڕدا، سنووره پێوانەییەکان ڕێزیان لێ بگیرێ، وەکو بەکارهێنانی کەمترین هێزی خوازراوو پێویست، ڕێزگرتن لە ژیانی خەڵکی شەڕنەکەر، خۆ لە بۆسەنەنان و غافڵکوژی، بەهەرحاڵ، لێکدانەوەی رادیکاڵانەی هاوچەرخ، لە چەمکی نەریتیی جیهاد بۆ دیفاع لە خۆکردنی تێپەڕاندووە بە ئاراستەی شۆرشێکی جیهانیی ئیسلامی. ئەم چەمکە نوێیەی جیهاد لەسەر هەستی بە قوربانیبوون ڕۆنراوە کە لە جیهانی موسڵمانەتیدا باوە لە پێوەندی لەگەڵ ڕۆژئاوادا. هەروابێتەوە، لێکدانەوەی رادیکاڵانەی جیهاد، هەموو کۆت و بەندێك لەسەر شەڕ هەڵدەگرێ. ئەوەتا بن لادن لە فەتوایەکی خۆیدا لە شوباتی 1998دا ڕێنوێنی موسڵمانان دەکا و دەڵێ تا پێتان دەکرێ ئەمریکایی و هاوپەیمانەکانیان، مەدەنی بن یان سەربازی، بکوژن[19]. ئیسلامگەرا رادیکاڵەکان کە جێگەیەکی ناوەندی لە سیستەمی باوەڕی خۆیاندا، بە چەمکی جیهادی بەچەك دەدەن، ئەو پێوەندییە تیۆلۆجیە دەپارێزن کە پاش شەڕوشۆڕە ئایینییەکانی سەدەی حەڤدەم لە ئەورووپادا مۆدیان نەماوە. ئا ئاوا، وەکو زۆر لە زانایان سەرنجیان داوە، شتێك نییە لەناو باوەڕە جەوهەرییەکانی ئیسلامدا، کە ئەو ئایینە لە هەر ئایینێکی تر زیتر بەرەو شەڕانگێزی پاڵ بنێ. ئەرك و فەرزی شەڕی ئایینی کە رادیکاڵەکان پەسندی دەکەن، بێ شك کلیلێکە بەرەو توندوتیژی.

گرنگە تێبینی ئەوەش بکرێ کە زۆرینەی موسڵمانان لە رووی ئەم لێکدانەوەیە بۆ جیهاد، دەوەستن و پێیانوایە "جیهادی گەورە"، خەباتێکی تاکەکەسیە بۆ خۆپاکژکردنەوە. هەرچی جیهادە لە شەڕگە، جیهادی گچکەیە. دامەزراوەی ئایینی خەڵکی سوننەمەزەب کە خۆی لە فێرگەی زانکۆی ئەزهەردا دەبینێتەوە کە کۆنترین و بەشکۆترین ئەنیستیتۆی ئەکادیمیی ئیسلامییە، ئەو فیکرییە رەتدەکاتەوە کە پێیوایە شەڕ دەستاوێژێکی راست و دروستە بۆ بەجێگەیاندنی ئەرك و فەرزی بلاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام، بێ لە هەندێ ناوازە،

ئەزهەر جیهادی بەچەك بە ئەرکی موسڵمانان نازانیّ لە سەردەمی ئەمڕۆدا و ستاتۆ و پلەو پایەی خەباتی چەکداری بۆ "قتال" دادەبەزێنیّ، لەکاتێکدا جەخت لەسەر ئەرکی ناسەربازیی جیهاد دەکاتەوە دژی خراپەو بەلای وەك: نەزانی، هەژاری و نەداری، نەساغی[20].

## لێکدانەوەو شرۆڤەی تر بۆ ئیسلام

موسڵمانانی دی، جیا لە قورئان و سوننە، دان بە راست و دروستی سەرچاوەکانی تری مەعریفەی ئیسلامی دا دەنێن و تەنانەت سەبارەت بە لێکدانەوەو پراکتیزەکردنی باوەڕ، زۆر لێکتر جودان.

## نەریتگەری

نەریتخوازان، بە شیمانەی زۆرەوە، زۆرینەی موسڵمانان پێکدێنن. "نهضة العلماء الاندنوسية" کە گەورەترین رێکخراوی کۆمەڵایەتیی موسڵمانێتیە لە جیهاندا و نزیکەی (35) ملیۆن ئەندامی هەیە، نوێنەرایەتی جیهانبینیی نەریتخوازی دەکا. نەریتخوازان بەگشتی کۆنەپارێزن و دەست بەو نەریت و بیروباوەڕانەوە دەگرن کە لە سەدەکانی پێشووترەوە بۆیان ماوەتەوە. ئەم نەریت و بەندوباوانە بەزۆری لە باوەڕو پراکتیکی خۆجێی هاتوون کە هەمیشە لەسەر بنەمای ئیسلامی سەختگر دانەمەزراون و بە تێپەڕبوونی کات وەك بەشێکی جەوهەریی ئایین بەئەژمار هاتوون. نەریتخوازان بەشکۆوە پیا لە مەزارگەی پیرو ئەولیاو چاکان دەنێنەوەو لێیان دەپاڕێنەوە کە شەفاعەتیان بۆ بخوازن. بڕوایان بە رۆح و موجیزە هەیە، نوشتەو کشتەکان دەکەن — بەکورتی کۆمەڵە بڕواو نەریت و بەندوباوێك کە بە تەواوەتی لە وەهابیەتی دەمارگیر و سەختگردا وەلا نراون[21]. نەریتخوازان، زۆرێکیان، چەند لایەنێکی باوەڕو مومارەسەی سۆفیانەیان وەرگرتووە کە لە خوارەوە باسیان لیّ کراوە. لەباری سیاسیشەوە، زۆریان خوخدەی لێبوردەییان هەیەو لە زەبروزەنگ و تیرۆریزم خۆش نابن. پرۆفیسۆر R. William Liddle کە فەقیهێکی

ئیسلامیی ئەندەنووسیە، پێیوایە تاکە شێوازێکی ترادیسیۆنالیزم لە ئەندەنووسیادا، ترادیسیۆنی درێژخایەنی بێبباکی سیاسییە لە ئیسلامدا. نەریتخوازان حەزدەکەن حەدیس و فەرموودەی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) بەبەڵگە بێننەوە دژی رووخاندنی تەنانەت فەرمانڕەوایەکی فاسق و نادادپەروەریش. ئەمە یارمەتیمان دەدا، کە بۆچی لەنێو نەریتخوازانی ئەندەنوسیادا، مەیل و خولیایەکی کەم بەرەو ئوسوڵییەت هەیە (لەراستیدا هیچ مەیلێك نییە)[22]. بەگشتی نەریتخوازان لە هەموو جێیەکدا هەروان، وێڕای ئەوە نەریتگەریی ئەندەنووسی، میانڕەوی و هەمەگیریی خۆی هەیە. نەریتخوازان، پتر لە موسڵمانانی دی، خەڵکی غەیرە دین بەسەرچاوەی گیروگرفتی موسڵمانان نازانن و سەبارەت بە هاوکاری و دیالۆگی نێوان ئایینەکان کراوەترن. هەرچەندە، نەریتخوازان، وەك هەموو موسڵمانانی دی، کە دێنە ناو سیاسەتەوە، بازنەو ئاقاری سەرەکیی چالاکیی ئەوان بریتییە لە ئاقارو بازنەی کولتووری و کۆمەڵایەتی و بەرەودان بە پەروەردەی ئیسلامی و پاراستنی بەهاو بنەماگەلی نەریتخوازانەی ئیسلامی. ئەوانە پێیانوایە هیچ ناسازگاری و دژایەتیەك لەنێوان باوەڕی ئایینیی خۆیان و دڵسۆزی بۆ دەوڵەت و قانوونەکانی نییە.

## سۆفیگەری

سۆفیگەری، بەندوباوی رۆحانیەتیی ئیسلامی، بریتییە لە شێوەیەکی دیکەی جیهانی ناوەکیی ئیسلام کە جەخت لەسەر تەجرەبەی سۆزەکی و کەسایەتیی سۆفی دەکاتەوە. بەزۆری بە "ئیسلامی میللی" ناودەبرێ و شوێنکەوتووی زۆری هەیەو لە رێگەی زنجیرەی تەریقەتەوە، بناخەیەکی گرنگ بۆ ستراکتوری کۆمەڵایەتی دادەنێ. سەرکردایەتیی کاریزمایی توخمێکی پێکهێنەری ناوەندیی پراکتیکی سۆفیانەیە و بەزۆر شێخی تەریقەتەکان جێگەو رێگەیەك بۆ خۆیان لەناو توێژو تاقمی سیاسی دەکەنەوە. سۆفیگەری بەندوباوێکی بەهێزە لە ئاسیای ناوەڕاست، تورکیا، باکورو رۆژئاوای ئەفریقیا، خوارووو خوارووی رۆژهەڵاتی

ئاسیاو تا بە ئەمڕۆش دەگات تەریقەتگەلی سۆفی لەپاڵ ڕۆڵی ئایینیی خۆیاندا، ڕۆڵی سیاسیش دەگێڕن[23]. بیروباوەڕی نەریتخوازی و سۆفیگەری، لە کەشوهەوای هەژان و ئاڵوگۆڕەکانی سەدەی بیستەمدا، جێگەی خۆیان لەناو جیهانی ئیسلامیی میللیدا گرتووە، لێ لەم ساڵانەی دواییدا، لەبەر کاریگەریی و نفووزی عەلمانیەت و مۆدێرنیزم و ئوسولیيەتی نوێ، لەناو ریزی هەندێ ئیلیت و کۆڕو کۆمەڵی موسڵماناندا لە کورتییان داوە. سەلەفییەکان و وەهابییەکان، سۆفیزم بە دژمنێکی سەرسەختی خۆیان و بە لەلادانێکی گەندەڵانەی لە ئیسلام دەزانن. ڕەتکردنەوەی سۆفیگەری لەلایەن ئوسولییە سوننە مەزەبە رادیکاڵەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ نووسینەکانی (ئیبن تیمیە) لە سەدەی سێزدەمدا کە شوێنکەوتە مۆدێرنەکانی ئیسلامی رادیکاڵ وەکو قەوان دەیلێنەوە. بنکەی سعودیەی دامەزراوەی "الحرمين" لیستێکی دوورودرێژی تایبەتمەندی دژ بە سۆفییەکان بڵاوکردۆتەوەو سۆفییەکان بەوە تاوانبار دەکەن کە دەڵێن هەموو ئایینەکان راست و دروستن و، دیدو تێڕوانینی پاسیڤانە بڵاودەکەنەوە. سۆفییەکان، بەقسەی دامەزراوەی "الحرمين" وایان لە موسڵمانان کردووە بڕوا بەوە بکەن کە "کارو خێزان گەورەترین جیهادە، لە جیاتی ئەوەی بە شیر ئایینی خوا لەسەر زەوی پیادە بکەن"[24]. لە هەر جێیەکدا، بزاڤگەلی ئیسلامی رادیکاڵی دەسەڵاتیان گرتبێتە دەست، ئەوا ڕێگەی پراکتیکی سۆفیانەیان نەداوە. دوای گرتنی کابول لە 1996، تالیبان هەندێ لە رابەرە بەنێوبانگەکانی سۆفیانیان گرت و ڕێوڕەسمی سۆفیگەرانەی زیکرکردن و وتنەوەی سرودی ئایینی و خۆهەژاندن و حاڵ لێهاتن و جەزبەگرتن بۆ زێتر لەخوا نزیکبوونەوەیان، لێ حەرام کردن[25].

نەریتخوازو سۆفییەکان، کە بوونەتە قوربانی دەستی سەلەفی و وەهابییان، وایان لێهاتووە ببنە هاوپەیمانی ڕۆژئاوا لە خەبات دژی رادیکاڵەکان و بۆ دەستنیشانکردنی شوێنی ئیسلام لە جیهانی نوێدا[26]. لە لوبنان، "جمعية المشاريع الخيرية الاسلامية" کە بزووتنەوەیەکی سۆفیگەرییە، ئایدیۆلۆجیایەکی داکۆکیکارانەیان پەسند کردووە و پەیڕەوی دەکەن دژ بە ئایدیۆلۆجیستە

ئیسلامییە رادیکاڵەکان لە ئیبن تیمیەوە بگرە تا مەودودی، سەیید قوتب و فەتحی یکن-ی "الجمعیة الاسلامیة اللبنانیة". ئایدیۆلۆجیای الاحباش جەخت لەسەر میانڕۆیی و لێبوردەیی دەکاتەوە، سەرباری دژایەتیکردنی چالاکی سیاسی و زەبروزەنگ نواندن[27]. لە پاکستان، ئیسلامی سیاسیی رادیکاڵ، لە لایەن بزاڤێکی سۆفیگەرییانەی چوست و چالاکەوە بەرەنگاری دەکرێ[28]. وێڕای ئەوەی کە بەگشتی ناکۆکی و هەندێ جار بەرانبەر یەك وەستان باڵی بەسەر پێوەندیی نێوان سۆفییەکان و ئیسلامییە رادیکاڵەکاندا کێشاوە، هەندێ جاریش سۆفییەکان پشتەوانی لە رادیکاڵەکان دەکەن. بۆ نموونە، هەندێ تۆڕی سەربازیی ئیسلامی سیاسی لەناو هەندێ لقی تەریقەتی نەقشبەندی لە ئاسیای ناوەڕاست و لە عێراقدا دامەزراوە[29].

## مۆدێرنیزم

موسڵمانە مۆدێرنەکان، بەشێکی ئەو بزاڤەن کە سەدەیەك لەمەو پێش بۆ بەرەنگاربوونەوەی «نەزانی و خورافات» و هەندێ رێورەسمی ئیسلامی نەریتخواز دەستی پێکردووە نەمازە: پیرۆزراگرتنی گۆڕو مەزاری پیرو چاك و ئەولیایان و نزاو پاڕانەوە لێیان. لەهەمانکاتدا، کار بۆ بەهارمۆنیکردنی توخمگەلێکی ناو ئایینی ئیسلام دەکەن لەگەڵ دنیای ئەمڕۆدا. مۆدێرنیستەکان، رەگ و ریشەی سەلەفییانەیان هەیە، بەڵام سنوورە تیۆلۆجییە بەرتەسکەکانی سەلەفیزمیان بەزاندووە. مۆدێرنیستەکان پێیانوایە، ئەگەر ئیسلام بەراست و دروستی راڤە بکرێ، ئەوا بەتەواوی لەگەڵ مۆدێرنیتەدا دەگونجێ و بەهۆی عەقڵ و ئاوەزەوە پێناسە دەکرێ و روون دەکرێتەوە. مۆدێرنیزمی ئیسلامی، زۆر قەرداری بیرمەندەکانی سەدەی نۆزدەیە لە بابەتی ریفۆرمیستی پەروەردەیی میسری، محەمەد عەبدەو هەڵسوڕاوی سیاسیی ئێرانی، جەمالەدینی ئەفغانی. هەردوو وەك مەتەرێزێك لە رووی دەسەڵاتی رۆژئاوادا، جاریان بۆ یەکێتیی موسڵمانان و ریفۆرم داوە. محەمەد عەبدە، بە بزووتنەوەکەی خۆی گوتووە سەلەفی، بەڵام

داخوازی لە هاوسەردەمەکانی خۆشی ئەوەبووە کە دەرس لە پێوەندی بە گەلانی ڕۆژئاواوە وەربگرن و لەوانەیە شتێکیان لێ فێر بن. جەمالەدینی ئەفغانیش، ئاماژەی بۆ موفارەقەی مێژوویی و پەرپووتیی فەلسەفەی ئیسلامی کردووە لە سەردەمی زانستی نوێ و تەکنەلۆجیادا (Choueri, 1990). بیروباوەڕی ئەو دووانە یارمەتی خەملین و گروانی بیری مۆدێرنیتەی داوە و لە لایەن ڕێکخراوگەلێکی سەرەتای سەدەی بیستەمدا وەك "المحمدیة" و "جمعیة علماء الجزائر" پەسندکراوە.

هەندێ لە مۆدێرنیستەکان پشتەوانی لە جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی دەکەن، بەڵام ئەو شەریعەتە بە بنیادێکی مرۆڤکردی دەزانن کە پێویستی بە هەموارکردن و دەسکاری هەیە تا لەگەڵ هەلومەرجی نوێدا هەڵبکاو بگونجێت. مۆدێرنیستەکان، لەگەڵ پرەنسیپی ئیجتیهادی[30] سەربەخۆ دان و وەکو مەسیحییە پرۆتستانەکانی ڕۆژئاوا، بڕوایان بە ئاگایی و ویژدانی تاکەکەسی هەیە لە هەمبەر ملکەچی کوێرانە بۆ دەسەڵات و نفووزی عولەمایان. ترادیسیۆنی Abduhist ی سەدەی بیستەم، هەردوو لابالی لیبراڵی و ئیسلامی لێ بۆوە[31]. مۆدێرنیستەکان دەیانەوێ ئیسلام و بەهاگەلی دیموکراسیی لیبراڵی ڕۆژئاوایی ئاشت بن. جەختکردنەوەو پێ داگرتنی مۆدێرنیستەکان لەسەر حوکمی قانوون و عەقلانییەت وای لێکردوون، چەمکگەلی ڕۆژئاوایی وەك: دیموکراسی، پلورالیزم و مافەکانی مرۆڤ پەسند بکەن. مۆدێرنیستە لیبراڵەکان، پارێزگاری لە هەندێ نۆبەرە توخمی ئیسلامەتی دەکەن وەك پرەنسیپی شوورا، کە لە پێش دیموکراسیی مۆدێرندا، لە ئیسلامدا هەبووە. هەروا ئەوان جیاوازی لەنێوان ئەحکامەکانی شەریعەتدا دەکەن کە لەباردی خواپەرستییەوەن و تەواو ورد نین، لەگەڵ ئەو ئەحکامەی لەبارەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوەن و کەمتر وردن. لەئەنجامدا، ئەوانە دەکارن، شەریعەت لەگەڵ قانوونی عەلمانی و پراکتیکی مۆدێرندا بسازێنن (Mondal, 2002). سەرۆکی محەمەدیە لە ئەندەنووسیا ئەحمەدی صەفی مارف، فەقیە و هەڵسوڕاوی بواری مافەکانی مرۆڤ وەك چاندرا

موزدفەری مالیزی و عەبدوڵڵا ئەحمەد ئەلنەعیمی سوودان، لە مۆدێرنیستە لیبراڵەکان بەئەژماردێن.

ئەو مۆدێرنیستانەی مەیل و خولیایەکی ئیسلامییانەیان هەیە، لەو ئوسوڵییانە نزیکترن کە بانگەشە بۆ دامەزراندنی حکومەت لەسەر بنەمای شەریعەت دەکەن. تێکهەڵکێشێکی بەرچاو لە نێوان مۆدێرنیستەکان و ئوسوڵییەکاندا هەیە، لێ بەگشتی مۆدێرنیستەکان گیانی دەمارگیرانەیان تێدا نییەو حەز بە توندوتیژی ناکەن کە سیماو خەسڵەتی هەندێ گروپی رادیکاڵی ئوسوڵییە. حزبی ئیسلامی مالیزی و حزبی عەدالەتی پەرەسەندوو لە ئەندەنووسیا، توێژێکی ناو بزووتنەوەی موحەممەدی ئەندەنووسی، حەسەن ئەلتورابی لە سوودان، نوێنەرایەتی مۆدێرنیزمی ئیسلامی دەکەن.

## عەلمانییەت

موسڵمانان ژمارەیەکی زۆریان، تەنانەت زۆرینەی هەندێ نەتەوەی موسڵمان، عەلمانین، ئەوانە لە ژیانی تایبەتی خۆیاندا، بەدینن، بەلام پشتەوانی لێکجیاکردنەوەی ئایین و دەوڵەت-یش دەکەن و قانوونی عەلمانی دەخەنە پێش شەریعەتەوە. هەڵبەت عەلمانیەت لە رۆژئاوا دیرۆکێکی درێژی هەیە، پشتەوان و لایەنگرانی عەلمانیەت، ئاقارێکی بەرفرەوانی بیروڕایان هەیە. لەجیهانی موسڵمانەتیشدا، وەکو ئەورووپای پێش مۆدێرن، لە مێژە گرژی لە نێوان پێداویستیی پراگماتیکی حوکمڕانان و داخوازییەکانی ئاییندا هەیە (Mondal, 2002) لەسایەی سەلجوقییەکان و سەردەمی هەرە زووی عوسمانلییەکاندا، سەرکردایەتیی سیاسیی گەلی تورك و سەرکردایەتیی ئایینی، لێکجودا بوون، سوڵتان، دەسەڵاتی سیاسی هەڵدەسوڕاندو خەلیفەش تەنیا وەزیفەو ئەرکی ئایینی. ئەم لێکجودابیە رەسمییە لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم لە ساڵی 1517دا بە کۆتاهات و ئۆفیسی سوڵتانی و خەلیفایەتی بوونە یەك. لە ئیسلامی شیعەگەردا، ئەم لێکجودابیەی نێوان هەردوو بواری دەوڵەت و ئایین، تۆختر بوو،

ئاخونده شیعەکانی عیراق لە سەردەمی عوسمانلیاندا، خۆیان لە کاروباری دنیایی نەدەگەیاندو ڕێگەشیان بە دەوڵەت نەدەدا خۆی لــە کاروبــاری ئــایینی بگەیــەنێ (Cole, 2002). کۆماری تورکیا تاقیکردنەوەیەکی هەمەگیری لە بەعەلمانیکردن لە جیهانی موسڵماننــشیندا هەیــە. دامەزرێنــەرانی کۆمــار لــە تورکیــا، وەکــو ئەنتی-ئەکلیرکییەکانی کۆماری سێیەمی فەرەنسا، کۆت و بەندیان بۆ چالاکییە ئایینییەکان و دەرکەوتنی ڕەمزو سیمبولی ئایینی دانا. ئــەریٚ مــۆدێلی تورکیــا دەتوانێ لە سەردەمی ڕابوون (صحوە)ی ئیسلامی خــۆی بــەپێوە بگــرێ، ئەمــە پرسیارێکەو هــەروا بــە ئاوالــەیی دەمێنێتــەوەو لــەم لێکۆڵینەوەیــەدا دەیخەینــە بەرباس و لێدوان.

دەکرێ عەلمانییەکان، دابەش بکەین بۆ: عەلمانییە لیبراڵەکان، واتــە ئەوانــەی هاوپەیمانێکی سروشتیی جیهــانی دیمــوکراتین و ئاراســتەو بــەها سیاســییەکانیان لەگەڵ موسڵمانە لیبراڵەکاندا دەسازێ، بۆ ئەوانەش کە عەلمانیی ستەمکارن یــان ئــەنتی-دیمــوکراتین: لەبابــەتی مارکسیــستەکان، "سۆسیالیــستە عەرەبــەکان"، ناسیۆنالیــستە تونــدڕەوەکان بــە هــەموو تەوژمەکانیانــەوە. هەنــدێ ڕژێــم و بزووتنەوەی عــەلمانیی ســتەمکار، وەك ئەندەنووســیای دوای ســۆهارتۆ، توانیــان بەرەو دیموکراسیی لیبراڵی گەشە بکەن. ئەوانەی دی وەکو حزبی بەعس لە ســوریا و عیراق، بوونە تاقمێکی هەڵپەرست و پشتەوانی ئیستیبداد، بــەبێ ئــەوەی یــان کەمێك بەرەو دیموکراسی گەشە بکەن. هەرچەند لــەباری تیوریــیەوە ئــەو ڕژێمــە ستەمکارانە، عەلمانی بوون، بەڵام هەندێ جار پێیان باش بووە پەنا بــۆ ســروت و ڕەمزی ئیسلامی ببەن و هاوپەیمانی لەگەڵ تیرۆریست و توندڕەوە ئیسلامییەکاندا بکەن. پێوەندیی نێوان ڕژێمی سەدام حوسێن و ئەنسارولئیــسلام کــە گروپێکــی تیرۆریستە لە عیراق و تان و پۆ و ڕایەڵکەی لەگەڵ ئەلقاعیدەدا لەو بابەتەیە[32].

## ئایین، سیاسەت و دەوڵەت

ئوســوڵییە رادیکاڵــەکان، بڕوایــان وایــە، ڕێنوێنییــەکانی ئیــسلام پتــەو و یەکگرتوون و هەموو لایەنەکانی ژیانی بەرەی مرۆڤ دەگرنەوە. هەروەکو، حەسەن ئەلبەننای دامەزرێنەری ئیخوانولموسلمین لە پێناسە وەرگیراوە چەندبارەکراوەکەی بۆ ئیسلام دەڵێ «ئیسلام، ئاقیدەو دەوڵەتە، کتێب و شیرە، شێوازێکی ژیانە». لەبەرئەوەی سیاسەت و ئایین بە قووڵی تێکەڵی یەك بوونە، لەکۆتادا، هەموو گرفتەکان ئایینین و هەموو کێشەیەکی سیاسییش رەهایە. لەبەر ئەوە، وەهابییەکان و هەندێ سەلەفیی تری توندڕۆ، بێ دڵ لە دڵ دان، موسڵمانانی دیکە کە هاوئاقیدەی ئەوان نەبن، بە «کافرو خوانەناس»یان دادەنێن.

هەرچی موسڵمانی نا ئوسوڵییە، پێیوایە ئایین رۆڵێکی لە سیاسەتدا هەیە، بەڵام ئایین ناچێتە ژێرباری سیاسەت یان نایسڕێتەوە. میانڕۆیەکان پێیانوایە، ئیسلام و دیمۆکراسی بەیەکەوە دەسازێن. تا ئەو رادەی کە پلورالیزم لە جیهانی موسڵمانەتیدا رەگ دادەکوتێ، لەوانەیە موسڵمانە میانڕۆیەکان تەریبی هەڵوراوانی ئیسلامی سیاسی، وەکو دیموکراتخوازە مەسیحییەکانی ئەورووپا جێگەیەك بۆ خۆیان بکەنەوەو وەك سەمتێکی ئایینی نەك دادوەرێکی لێزانی ئاسمانی کاروباری مرۆڤ، بەشداری پرۆسەی سیاسیی عەلمانی بکەن[33].

هەڵبەت، پرسیاری یەکلاکەرەوە ئەوەیە، داخوا ئێمە دڵنیاین کە «ئیسلامێکی سیاسیی میانڕۆ» هەیە -یان دەتوانێ هەبێ- لە جیهانی هاوچەرخی موسڵماننشیندا؟ جیاوازی واقیعی لە نێوان سیاسەتی ئایینیی ئیسلامی و ئەورووپاییدا، پێشاژۆیە. لە رۆژئاوادا، پێشکەوتنی سیاسی لە دوو سەدەی رابردوودا، ئایینی وەکو هێزێکی سیاسی، دەستەمۆ کردووە و بواری بە دەوڵەتی مۆدێرنی رۆژئاوایی داوە درێژە بە پرۆسەیەکی سیاسیی عەلمانی بدا و ئەو حزبانەش کە بنەمایەکی ئایینیان هەیە، نفووز و کاریگەری خۆیان هەبێ، لێ نەك سەردەست و خۆسەپێن. پرۆسەیەکی هاوشێوەی سیاسی لە زۆربەی وڵاتانی

موسڵمانن‌شیندا رووی نه‌داوه. ئه‌رێ ده‌وڵه‌ت ده‌توانێ له‌م به‌شه‌ی جیهاندا، سه‌رکه‌وتووانه ده‌سه‌ڵاتی ده‌ست لێ نه‌دراوی سیاسیی ئایین، بێنێته ژێر باری خۆی و سه‌قامگیری خۆی له پرۆسه‌ی بینراودا له‌ده‌ست نه‌دا؟[34]

## ده‌وڵه‌تی ئیسلامی

پێوه‌ندیی له‌بارو گونجاوی نێوان ئایین و ده‌وڵه‌ت، پرسێکی چاره‌سه‌رنه‌کراوی سه‌ره‌کییه له گه‌شه‌کردنی سیاسیی ده‌وڵه‌ته موسڵمانه مۆدێرنه‌کان و دۆزێکی دیاریکه‌ره که هێڵ و داوه جیا-جیاکانی فیکری سیاسیی ئیسلامی لێکده‌کاته‌وه. ئیسلامییه رادیکاڵه‌کان له هه‌وڵی ئه‌وه‌دان نیزامێکی ئابووری، کۆمه‌لایه‌تی و سیاسیی ئیسلامی دابمه‌زرێنن. هه‌رچه‌نده له واقیعدا، گروپه رادیکاڵه‌کان له‌ناو خۆیاندا، سه‌باره‌ت به سروشتی وردو راسته‌قینه‌ی ده‌وڵه‌تێکی ئیسلامی، ناکۆکی زۆریان له‌نێواندا هه‌یه. ئه‌م چه‌مکه بۆ خۆی له‌راستیدا داهێنانێکی سه‌ده‌ی بیسته‌مه. ده‌قه هه‌ره پیرۆزه‌کانی ئیسلام: قورئان و سوننه‌ت، ته‌نیا پره‌نسیپگه‌لێکی گشتی له‌باره‌ی حوکمڕانی ده‌خه‌نه به‌رچاو نه‌ك نه‌خشه‌یه‌کی تێروته‌سه‌لی تایبه‌تمه‌ند[35].

ئه‌گه‌ر ئێمه ئه‌و ده‌وڵه‌ته مۆدێرنانه‌ی به‌خۆیان ده‌ڵێن ئیسلامی له‌به‌رچاو بگرین، ده‌بینین جیاوازی گرنگ له‌نێوانیاندا هه‌یه. بۆ نموونه، له مۆدێلی سیاسیی ئێراندا، پره‌نسیپی سیاده‌ی ئه‌کلیرکی به‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی سیاسیدا خۆی باش دامه‌زراندووه، به‌ڵام مۆدێلی عه‌ره‌بستانی سعودی یان سوودان، پێڕه‌وی له نه‌ریتێکی حوکمڕانیی سوننه ده‌کا که راوێژ و پرس به دامه‌زراوه‌ی ئایینی ده‌که‌ن لێ مل که‌چیان نابن. له مۆدێلی تالیباندا، ده‌سه‌ڵاتی فیقهی و ئایینی و سیاسی هه‌ریه‌ك بوون. له‌کاتێکدا له پاکستان که خۆی به ده‌وڵه‌تێکی ئیسلامی ده‌زانێ، سوپا، به فرتوفێڵی ده‌ستوورییانه‌ی شێوه- رۆژئاوایی، حکوومه‌تی کۆنترۆڵ کردووه[36].

مۆدێله‌که هه‌ر چییه‌ك بێ، خه‌سڵه‌تی جیاکه‌ره‌وه‌ی ده‌وڵه‌تی ئیسلامی بریتییه له‌و ئایدیایه:"حاکمیه‌ت" بۆ خوایه نه‌ك بۆ خه‌ڵك، ده‌بێ شه‌ریعه‌ت ده‌سه‌ڵاتی

قانوونیی هەرە باڵای وڵات بێ. ئەمەش پرسیارێکی بنەڕەتی دێنێتە گۆڕێ: داخوا ئەم چەمکەی ئیسلام لەگەڵ چەمکە نوێیەکانی دیمۆکراسی دەسازێ و ڕێك دێتەوە؟ هیچ کام لەو دەوڵەتە خۆ بە ئیسلامیزانانە (بێ لە مالیزیا، کە خۆی وەکو وڵاتێکی ئیسلامی ناساندووە، بەڵام لە ڕاستیدا خۆی لەسەر پرەنسیپە سیاسییەکانی ڕۆژئاوا ڕێکخستووەو دامەزراندووە)، ناکرێ بە دەوڵەتی دیموکراتی دابنرێن، بەڵام داخوا ئەمە لە مۆرکی ئیسلامییانەی دەستووری ئەو وڵاتانەدا هاتووە، یان لە فاکتەرە سۆسیۆ- سیاسییەکانی تردا؟ تاقیکردنەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران کێسێکی سەرنجڕاکێشە بۆ دانە بەرباس و لێکۆڵینەوە. ڕێوشوێنە دەستوورییە لك و پۆپدارەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران، بوارو دەرفەتی بۆ نەشونمای شێوەیەکی سنووورداری دیمۆکراسی کردۆتەوە، لێ هێشتا ئەم پرسە یەکلا نەبۆتەوە کە داخوا دەشێ پێشکەوتنی زێتر لەسایەی سیستەمی ئێستای سەروەری ئایینیی ئاخوندەکان بێتە دی؟ یان دەبێ سەرخانی ئایینی- سیاسی ڕامالدرێ تا ڕێگەو دەرفەت بۆ هاتنەئارای دەوڵەتێکی دیموکراتیی ڕاستەقینە بکرێتەوە؟

## شەریعەت "قانوونی ئیسلامی"

بەشێکی کێشەساز لەو گفتوگۆیەی لەبارەی ئیسلام و دیمۆکراسییەوە دەکرێ، لە دەوری پرسی شەریعەت دەخولێتەوە. شەریعەت جێبەجێکردن بەتەواوی، قانوونی سزادان "حدود" و مۆرك و خەسڵەتی فیزیکی سزاکانیش دەگرێتەوە، بۆ نموونە ڕەجمکردنی زیناکار، دەستبڕین..تاد، کۆت و بەنددانان لەسەر مافەکانی ژنان، بەشێکی ناوەندییە لە بەرنامەی سیاسیی ئوسوڵییەکان. لە دەرەوەی هەندێ بازنەی ئیسلامی، ئەم پراکتیکانە بەگشتی لەگەڵ پراکتیکی عورفی ناسازێن نەك لەبەر پێوەرو ستاندارده هاوچەرخەکانی مافی مرۆڤ، بگرە لە هەر وڵاتێکی موسڵمان، بێ لە ئێران و سعودیە، جێبەجێکردنی شەریعەت تەنیا پێوەندی بە میرات و باری خێزانییەوە هەیە.

هەندێ لەو پرسانەی کە لەنێوان ئایین و سیاسەتدا هەیەو کێشە دەنێنەوە، ئەو حوکمانەن کە لە لایەن دادگەکانی ئیسلامییەوە لە پاکستان و نایجیریا

دەرچوون کە تیایدا دەبێ ئەو ژنەی لە دەردوەی ژن و مێردایەتی (بەبێ شووکردن) منـدالّی بـووە، تـا مـردن، رەجـم بکـرێ. دیـارە بەبۆچـوونی دادگـاش، ئەمـە بەڵگەیەکی روونە لەسەر زیناکردن، ئەگەر ژنەش بڵێ بـەزۆر پـڕی دراوەتـی. لـە ساڵی 2001دا لە ناوچەی ئـامبۆن لـە ئەندەنووسـیا کـە میلیـشیای لاسـکاری رادیکاڵ کۆنترۆڵی کردووە، یەکـەمین رەجـم، هەڵبـەت ناقـانوونی، لـە مێـژووی ئەندەنووسیا ئەنجامدرا. جێبەجێکردنی سزاگەلی جینایی ئیسلامی بۆ ئەو بـوارو بازنانەی کە پێشتر تیایدا بەرێوەنەچوون، دەکرێ بە هیمایەکی بەهێز دابندرێ بـۆ نەشونمای نفووزی ئیسلامی سیاسیی رادیکاڵ.

نابێ بزووتنەوە تەنیا بەیەك سەمت و ئاقاردا بڕوا. زاناو فەقیهەکانی ئیـسلام ددانیان بە مۆدێرنیزەکردنی شەریعەتی ئیسلام دا نـاوە. قورئـان و سـوننەتی لێ دەرچێ، دەنا موسڵمانان، شەریعەت بـە دەسـکردو زادەی بـیری مـرۆڤ دەزانـن و لەسۆنگەی ئەمەوە مایەی راڤەو لێکدانەوەیە. هەندێ مەزهەبی ئیـسلامی وەك: حەنەفی، شافیعی، مالیکی و حەنبـەلی لـە ئیـسلامی سـوننەگەر و مەزهـەبی جەعفەری لە ئیسلامی شیعەگەر، سەبارەت بە پێناسەو کێـشی رێـژەیی هەنـدێ پرەنـسیپی شـەرعیی ئیـسلامی لێکجیـاوازن، بەتایبـەتی لـەبارەی میتـۆدو سـنوورەکانی ئیجتیهـادەوە (Hourani,1991). لـە سـەردەمە جیـا-جیاکـانی پەرەسەندنی ترادیسیۆنی شەریعەتی ئیسلامی، خیلاف و جیاوازی لە بیروڕا نـەك هەر رێگەی پێ دراوە، بەڵکە هان و دنەش دراوە. لەمبارەوە دەبێ تێبینی ئـەوە بکرێ، کە هەندێ پراکتیکی کۆمەڵایەتیی ستەمکارانە لەناو هەندێ کۆمەڵگـەی موسڵماننشیندا هەن، بەتایبەتی لەبارەی رەفتار لەگەڵ ژنانـدا، ئـەو پراکتیکانـە هەندەی پێوەندییان بە داب و نەریتی خێڵەکی و عورف و عادەتەوە هەیە ئەوەندە پێوەندییان بە ئیسلام و شەریعەتی ئیسلامەوە نییە یان کەمە[37].

**دابەشبەندیی سوننە- شیعە**

زۆرینــەی جیهــانی موسڵمانــشین بــە مــەزەب سوننەن، لیّ کەمینەیــەکی بەرچاوی موسڵمانانیش شیعە مەزهەبن. کۆڕو کۆمەڵ. جیاجیاکانی شیعەگەری- هەڵبەت دوانــزە ئیمــامی هــەرە گرینگەکەیانــە- 15٪ی ســەرجەم دانیــشتوانی موسڵمانانی دنیا دەبن. دوو مەزەبــە ســەرەکییەکەی تــری جیهــانی ئیــسلامی، زەیدیەت و ئیسماعیلیەت بە مامناوەنجی لــە پراکتیکیــی ئیــسلامدا بەئــەژمار دێن. شیعەکان لە ئێران، عیراق، بەحرێن و ئازەربایجان زۆرینەن. هەروا ئێستا لــە لبنان-یش، بە کۆمیونیتەی هەرە مەزن حیساب دەکرێن. هــەروا کەمینەیــەکی بەرچاویشن لە پاکستان، یەمەن، تورکیــا و لــەنێو موســڵمانەکانی هیندســتاندا، سەیری شکڵی ژمارە (3) بکە.

لێکدابڕانی موسڵمانی سوننە و موســڵمانی شــیعە دەگەڕێتــەوە بــۆ کێــشەو ئاریشەی نێوان موسڵمانان ســەبارەت بــە خەلیفــەی پێغەمبــەر محەمــەد (د.خ). شیعەکان هەر سیّ خەلیفە: ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانییان قەبوڵ نییە، عــەلی زاوای محەمەد(د.خ) و حوسێنی کوڕی بە جێگرەوەی شەرعی پێغەمبــەر دەزانــن. عەلی، خەلیفەی چوارەم، لە ساڵی 656زدا (وەکو دوو خەلیفەکەی پێــشە خــۆی، عوسمان و عومەر) غافڵکوژ کرا. حوسێن لە شەڕدا لە نزیك کەربەلا کە ئەمڕۆ لە عیراقێیە، لە لایەن هێزەکانی خەلیفە یەزیدی کوڕی مەعاویەوە: کە شیعەکان بە ستەمکارو زەوتکــەری دەســەڵاتی لەقەڵــەم دەدەن، کــوژرا. شــیعەکان لــە رۆژی عاشورا، کە رۆژێکی هەرە پیرۆزو بەخەمە لە رۆژژمێری شیعەدا، بەکۆمەڵ یادی کوژرانی حوسێن، دەکەنەوە.

شیعەکان بەندوباوێکی ئایینی هەرە بەسۆزیان ســەبارەت بە شــەهادەتی عــەلی و حوسێن و بەشکۆ سەیرکردنی مەزارو مەرقەدی جێگــرەوە: ئیمامــەکان پەرەپێــداوە. بەندوباوێکی میللییانەی شیعەی دوازدە ئیمامی دەڵیّ رۆژێك دادیّ ئیمامی دوازدەم کە لە سەدەی نۆیەمدا لەبەرچاوان پێوارو غەیب بووە، وەکو مەهدی لەو غەیببوونــە

پەیدا دەبێتەوە "ڕێنیشاندەر" و حوکمێکی عادیلانەی جیهانی دەست پێ دەکا. لەبەر هەستکردنی شیعەکان بە ناعەدالەتی و گەندەڵیی جیهان، زۆر لە شیعەکان لە مێژوودا، بە ئارەزووی خۆیان لە هاتنە ناو سیاسەت خۆیان بواردوەو بە کارێکی نالەبار، ئەگەر نەڵێین کارو بارێکی نا خواپەرستانەی، دادەنێن.

ئیسلامی شیعی، ئایینی رەسمییە لە ئێراندا و لە سەرووی 90٪ی دانیشتوانی ئێران شیعە مەزەبن. سوننەکان 5-8٪ی دانیشتوان دەبن (سوننەکانی ئێران بەشێوەیەکی سەرەکی کوردە ئیتنیەکانی کوردستانن)، لەگەڵ ژمارەیەکی ئێکجار کەمی ئەرمەنی و مەسیحیی ئاسووری، لەگەڵ هەندێ جولەکە، بەهاییە ستەملێکراوەکان و زەردەشتییەکان. تا ئێستا بەتەواوی ئەوە هەڵنەسەنگێندراوە کە حکوومەتی ئەکلیرکی (ئایینی) داهێنانێکی خومەینیانەیە؟ خومەینی و جێگرەوەکانی توانیان تەنیا دەسەڵات بەدەستەوە بگرن، پاش ئەوەی بەشێوەیەکی بنەڕەتی، مەزەبی مێژوویی شیعەی دوازدە ئیمامییان شێواند کە پێیوایە تا گەڕانەوەی ئیمامی دوازدەم دەبێ ئیمانداران دژایەتی دەسەڵاتی جیهانی بکەن. زۆربەی ئەندامە بەرچاوە بەرودواکانی شیعەی ئێران، فیکرەو بۆچوونە ئایینییەکانی خومەینیان لەبارەی شۆرش رەتکردەوە، لێ خومەینی و لایەنگرانی توانیان بە کۆنترۆڵکردنی دامەزراوە ئایینی و دەوڵەتییەکان ئەم رەخنانە دەمکوت بکەنەوە. هەروا شیعە لە عیراقیشدا، زۆرینەن، لە روانگەی ئایینییەوە ئەمە بۆ شیعەکان گرینگە. دوو شوێنی هەرە گرینگی «عتبات»ی پیرۆزی شیعە- کەربەلا، مەزاری ئیمامی عەلی و حوسێنی کوڕی، نەجەف- کەوتوونەتە ناو عیراق و بۆ ماوەیەکی درێژ سەنتەری تەفویزی ئایینیی شیعەگەری بوون. تا رووخانی رژێمی سەدام حوسێن، نوخبەی سیاسیی عیراقی لە کۆمیونیتەی عەرەبیی سوننە بووە کە نزیکەی 16٪ی دانیشتوانی عیراق پێکدێنن (19٪-ەکەی تر کوردن و نزیکەی هەر هەموو سوننە مەزەبن)[38]. پاشایەتی لەسەر کارلابراوی عیراقی لە 1958دا سوننی مەزەب بوو، لێ باڵادەستیی سوننەکان لە دوای هاتنەسەرکاری بەعس لە 1968 زەقتر

بۆوە. بە شیمانەی زۆرەوە سیمای رەهاو زەبروزەنگ ئاسای سیاسەتگەلی عیراقی لە دوای رووخانی پاشایەتی پەیوەندی هەبووە بە بنیادێکی سیاسی کە رێگەی داوە ئۆلیگارشیی سوننە فەرمانڕەوایی بەسەر زۆرینەیەکی شیعەی بندەست و دوورخراوەدا بکا[39].

ئەمڕۆ شیعە لە لبنان گەورەترین کۆمیونیتەی ئایینییە، بەڵام چەند گەورەیە بەوردی نازاندرێ، چونکە لە ساڵی 1970-ەوە سەرژمێری لە لبنان نەکراوە. هەروا لە پاکستان-یشدا، شیعە کەمینەیەکی بەرچاوەو بەردەوام کێشەو هەرایان لەگەڵ زۆرینەی سوننەدا هەیەو هەمیشە بوونەتە ئامانج و نیشانەی پەلاماری تیرۆریستی. هەروا پۆرگی تا رادەیەك باڵادەستی شیعە لە پەنجاب-ی پاکستان، لە دەوروبەری Avadh لە باکووری گەنج لە هیندستان و لە حەیدەرئاباد لە ناوەراستی Deccanو، لە کشمیر هەن.

شیعەکان نزیکەی یەك لەسەر سێی (هەندێ دەڵێن زۆرینە)ی دانیشتوانی پارێزگایەکانی رۆژهەڵاتی سعودیە پێکدێنن[40] کە ئایدیۆلۆجیای باڵادەستی وەهابی مۆری «شەریك بۆ خوا پەیاکردن»یان دەداتە پاڵ. لەم دوو دەیەی دواییدا، هەڵسوڕاوانی شیعە لەم پارێزگایانەدا لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە پشتەوانی دەکرێن و هان دەدرێن. بەهەرحاڵ، لەگەڵ جوڵە بەناقاری نزیکبوونەوەی تاران و ریاز، بەپێی راپۆرتەکان شیعەکانی عارەبی سعودیە ئێستا روویان لە ئێران وەرگێراوەو هەموو هیواو ئومێدێکیان بە ئەمریکایە. چاوەڕوانی ئەوانە ئەوەیە کە هەنگاونانەوە بەرەو دیموکراسی لە عیراق، رێگە بە شیعەی ئەو وڵاتە کە زۆرینەن دەدا دەستیان زێتر لە سیاسەتی ئەو وڵاتەدا بڕواو ئیدی توانایان زێتر ببێ بۆ یارمەتیدانی براکانیان لە سعودیە[41]. ئەم چاوەڕوانییانە دەرفەتێك بە ئەمریکا دەدەن کە سیاسەتی خۆی لەگەڵ ئاواتەکانی شیعەدا یەکبخات بۆ ئازادیی گەورەتری ئایینیی و ئازادیی قسەکردن و بیروڕادەربڕین لە کاروباری خۆیاندا لەو وڵاتانەی کە لەلایەن خەڵکانی دییەوە کۆنترۆڵکراون. ئەگەر ئەم یەکخستنە بێتە دی، ئەوا دەبێتە بەربەستێکی بەهێز لەبەردەم نفووزی ئێرانی رادیکاڵ و، هۆکارێك بۆ دامەزرانی پێگەیەکی چەسپاوی ئەمریکی لە ناوچەکەدا. هەڵبەت، ئەم

لەتەك یەك وەستانە بە ئاسانی نایەتە دی. بەڵێنشکێنی ئەمریکا سەبارەت بە لەرەگەوەدەرهێنانی بەعس، یان سیاسەتێکی ئەمریکی پرو-سوننە، متمانە بە قەول و بەڵێنی ئەمریکا نامێنێ بۆ بە دیموکراسیکردن و تەنانەت شیعە میانڕۆیەکانیش دەخاتە باوەشی ئێرانەوە. خاڵی سلبی ئەم سیاسەتە ئەوەیە کە سعودییەکان و سوننەکانی تر بەتایبەتی لە پێشاژۆی عیراقیدا، توڕە دەکات. هەروا ئەم سیاسەتە هەموو شیعەکانیش پێشوازی لێ ناکەن- بەتایبەتی توندڕۆیەکانی ئێران و حزب اللە ی لبنان. لەوەش گرینگتر وێستان لەگەڵ شیعەکان کە لە وڵاتانی عەرەبیدا کەمینەن، خۆی لە خۆیدا بنکەیەکی بەهێزی تێروپڕ نییە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە بەرفرەوانەکانی ئەمریکا لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لە لایەکی دییەوە، دەکرێ رێژەی نرخ- قازانجی ئەم لەتەك وێستانە، ببرێتە سەر ئەگەر تۆخمێك یان بەرەنجامێکی پرۆسەی دیموکراتیزەکردن ئەو گروپانە بەهێز بکات کە لەباری مێژووییەوە چەوساونەتەوە.

Figure O.3—Sunni and Shi'a Populations in the Greater Middle East




SOURCE: Central Intelligence Agency, *The World Factbook 2002*; Library of Congress Country Studies Azerbaijan (1994) and Iraq (1988).

### عەرەب و موسڵمانی غەیرە عەرەب

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەشێوەیەکی سەرەکی ناوچەیەکی عەرەبنشین و بێشکەی موسڵمانەتییە: هەموو دەوڵەتانی کەنداو بەرەو باکور، عیراق و سوریا، بەرەو ڕۆژئاوا، میسرو سوودان. ئا لەم ناوچەیەدا پێغەمبەر محەمەد (د.خ) سەری هەڵداو "ڕێنوێنینییە"کانی خۆی بۆ ناوچەکانی دی بڵاوکردەوە. شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام، بە مەککەو مەدینەشەوە، کەوتوونەتە ئێرە وەك کۆنترین جێگەی دامەزراوەکانی فێربوونی ئیسلامی. هەروا موسڵمانەکانی ئەم ناوچەیە تەنیا دەوروبەری 20٪ی موسڵمانانی جیهان پێکدێنن، لێکدانەوەکانی ئیسلام، چ سیاسی و چ غەیرە سیاسی، بەزۆری بەفیلتەری عەرەب و هاوێنەی عەرەبدا تێپەر دەبن. قسەو باسێکی زۆر لەمەڕ پرس و دۆزەکانی ئیسلام و سکاڵاکانەوە، قسەو باس بووە لە دۆزو سکاڵای عارەبان. بۆ نموونە: ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی لە کۆبوونەوەی لوتکەی خۆیدا لەساڵی 1981، جیهادی ڕاگەیاند بۆ ڕزگارکردنی قودس و فەلەستین، لێ کۆنگرە ڕەتیکردەوە هەمان شت بۆ ئەفغانستان بکا.(Kepel, 2002 ) زۆر لە موسڵمانان لە ناوچەگەلی غەیرە – عەرەبیدا لەگەڵ ئەم تێڕوانینە جیهانییە ناوەندییەی عەرەبدا نین. وەك ئاماژەیەك بۆ ئەم ئاراستەی تێکەڵکردنی بەرژەوەندی و هەست و نەستی عەرەب لەگەڵ ئیسلامدا، سەرۆکی پێشووی ئەندەنووسیا: عەبدولرەحمان وەحید تێبینی کردووە کە"سعودییە لە جیاوازی نێوان ئیسلام و کولتووری تایبەت بە خۆی ناگات"[42].

جیهانی عەرەبی بەهەر شێوازێك بۆی بچی هەمەچەشن نییە. هەست و نەستی میسرییان، ڕەگی ڕۆچووە بەناو بەندوباوی یەکێ لەهەرە کۆنترین شارستانێتیی جیهان، زۆر جیاوازی لەگەڵ وشك و برینگیی بیابانی قاقر بەقاقڕی عەرەبیدا هەیە. فەتحی عەرەبی لە سەدەی هەشتەمدا، کولتووری کەنارای ڕۆژهەڵاتی ناڤینی نەسڕیەوە. دانیشتوانێکی بەرچاوی بەربەر لە باکووری ئەفریقیادا هەن کە زمان و کولتووری خۆیان هەس. کۆمیونیتە کریستیانەکانی بەر لە ئیسلام لە سەرانسەری ناوچەکەدا بوونی خۆیان پاراستووە. کریستیانە

قیبتیەکانی میسر لە سەدا 8-15٪ی دانیشتوانی میسر پێکدێنن. کۆمیونیتەی مارۆنی لە لبنان کە لەباری سیاسییەوە تا روخانی وڵات و بڵاوبوونەوەی بێ سەروبەری و پشێوی لە هەشتاکاندا، باڵادەست بوون. کوردو تورکمانە ناعەرەبەکان زۆرینەی دانیشتوانی باکووری عیراق کە یەك لەسەر سێی عیراقە، پێکدێنن. هەروا لە سوریا کە وڵاتێکی زۆرینە سوننەیە، رژێمی ئەسەد فیرقەیەکی بچوکی بە ناوی عەلەویەت بەسەردا سەپاندوون کە لە لایەن موسڵمانانەوە بە لە رێ لادەر و هەرتەقە ناودەبرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم ناوچەیە لە مەغریبەوە بگرە تا عیراق یەك زمان، توخمەکانی مێژوو، بەندوباو و کولتووری هاوبەشیان هەیە کە یەك ناسنامەی جیا لە ناوچەکانی تری موسڵمانانیان جودا دەکاتەوە. زمانی عەرەبی، هۆکاری یەکخستنی سەرەکییە، کە زمانی قورئان و پرستیگی بێ وێنەی ئایینی و دەسەڵاتە. زمانی هاوبەش و پێڤاژۆی کولتووری، ئاسانکاری بۆ گواستنەوەی بەهاو کولتوور و سەرهەڵدانی میدیایەکی ناوچەیی کردووە. کێشەگەلێك لە پارچەیەکی جیهانی عەرەبدا- لەهەمووان بەرچاوتر کێشەی فەلەستینی- تەنانەت لەو ناوچانەشدا کە زۆر دوورن لە دەڤەری کێشەی ئیسرائیل- فەلەستین نارەزاییەکی زۆر دەنێنەوە. دووەمین هۆکاری یەکخەر، خۆناسینی تاك و نەتەوەکانە وەك "عەرەب".

مەبەستی ئەم لێکهەڵاواردنەی عەرەب و موسڵمانانی تری ناعەرەب لە جیهاندا ئەوەیە کە داخوا ئەو هۆکارانەی پەرگیری ئیسلامی بەرهەمدێنن تەنیا تایبەت و خاسیەتێکی ژینگەی سۆسیۆ –سیاسیی عەرەبن نەك هی جیهانی موسڵمانێتی سەرانسەر؟ شایانی باسە، جیهانی عەرەب رووداو و پێشهاتی بێ نیزامیی زۆرتری لێکەوتۆتەوە بەبەراورد لە گەڵ پارچەکانی تری ئەو جیهانەی کە جیهانی پەرەنەستێنی پێ دەگوترێ. بەپێی راپۆرتی ساڵی 2002ی "بوژانەوەی مرۆڤی عەرەبی سەر بە پرۆگرامی بوژانەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڵگەنامەیەکی بەرچاو کە تیمێك زانای عەرەب نووسیویانە، دان بەوەدا دەنێ

که خاسیەتێکی سەرەکی واقیعی عەرەبی ئەوەیە که "کەموکوڕییەکی رەگئاژۆ لە بنیادی دامەزراوەیی عەرەبدا هەن. بەپێی ئەم راپۆرتە دۆکیومێنتیانە، کێماسیەکی یەکلاکەرەوە هەیە لە ئازادی، توانا و دەسەڵاتداری ئافرەت و مەعریفەدا. لە حەوت ناوچەی جیهاندا، جیهانی عەرەبی لە هەموویان کەمتر خاڵی لەبارەی ئازادییەوە هەیە. (شکڵی 4). ئەم لێوەکۆڵینە پشتراستکراوەتەوە بە چەندین میلی "دەنگ و بەرپرسیارەتی" کە لە داتابێسی جیا-جیاوە وەرگیراون (شکڵی 5).

لەگەڵ هەڵبواردنێکی کەمدا، سیستەمگەلی سیاسیی ئۆتۆریتەی ستەمکار بەسەر دیمەنی سیاسیی عەرەبدا زاڵە. کەچی لە ئەمریکای لاتین، ئاسیا، ئەوروپای رۆژهەڵات و تەنانەت هەندێ ناوچەی بیابانی ئەفریقیا ئاراستەیەکی بەهێزی دیموکراسیان لە 1980-یەکان و نۆهەدەکاندا تاقیکردۆتەوە. وڵاتانی عەرەبی تا رادەیەکی زۆر لە ناو دیکتاتۆریەت و سیاسەتگەلی توندوتیژ و یەکتر رەتکردنەوەدو یەکدی قبوڵ نەکردن دامەزراون. ئەم پێشاژۆیە بەشێوەیەکی سروشتی بزووتنەوەی پەرگیری سیاسیی لێدەکەوێتەوە کە پەیامێکی پێیە بە زۆری زمانی ئیسلامی سیاسیی بەکاردێنێ. بەهەرحاڵ رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبی تەنیا سەرچاوەی رادیکاڵیزمی ئیسلامی نییە، هەندێ توخمی ئیسلامی لە خوارووی ئاسیا وەها توندو پەرگیرن وەك بڵێی لە رۆژهەڵاتی ناڤین هەڵقوڵاون و پەژیون. بزووتنەوەی دیوباندی لە سەدەی نۆزدەمدا لە هیندستان، فەندەمێنتالیزمی وەهابیان بڵاوکردەوەو لاسایی رەفتاری کولتووری عەرەبیان دەکردەوە: ئەوەو نەتیژە ئایدیۆلۆجییەکانی لە پاکستان، هان و دنەی تاڵیبانی ئەفغانستانیان دەدا[43] (Upadhyay, 2003).

بەپێچەوانەوە، بەشە نا عەرەبەکانی جیهانی موسڵمانەتی لەباری سیاسییەوە گشتگیرترن، زێتر لافی دیموکراتی، یان حکوومەتی نیمچە دیموکراتی لێدەدەن. لە جیهانبینیاندا زێتر عەلمانین. وەك لە فەسڵی سێیەمدا دیاری کراوە، پرسی ئیسلامی سیاسی لە تورکیا زێتر نموونەیەکی رۆژئاواییە تا رۆژهەڵاتی ناڤین.

تورکیا لە ناو رۆژئاوا لەباری دامەزراوەیی، ئابووری، ستراتیجی و تا رادەیەك کولتوورییشەوە جێگیر بووە. تورکیا ئەندامی ناتۆیەو پاڵێوراوە بۆ یەکیەتی ئەورووپی (EU). لەدوو دەیەی رابردوودا، بە تایبەتی، تورکیا بە شێوەیەکی بەرچاو لەگەڵ رێساو بنەمای ئەورووپیانە یەکیگرتووە لە بوارو ئاقاری وەك: خۆشگوزەرانی، دیموکراسی، خیاراتی رۆژبەرۆژدا. ئائاوا، سیاسەتگەلی ئیسلامی لە تورکیا شەفافانەتر و تا رادەیەکی گەورە بە هۆی پێشازۆی نێونەتەوەیی پێوانەیی لە باقی ناوچەکانی تری رۆژهەلاتی ناڤین کاری لێکراوە. هەرچەندە لەمەدا تورکیا جیایە لە زۆربەی ولاتانی عەرەبی و لەوانەیە لە ئاسیاش، ئەم بەیەکگەیشتنە لەگەڵ بنەماو نۆرمەکانی جیهانی نوێ دیسان لە خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا جێگەی خۆیان گرتووە.

لەمبارەوە، دکتۆر ئازیومەردی ئەزرا، سەرۆکی زانکۆی ئیسلامیی دەوڵەتی ئەندەنووسیا، کە دامەزراوەیەکی دیراساتی ئیسلامی و جێگەی ریزە لەو ولاتەدا، تێبینی کردووە کە ولاتە موسڵمانە هەرە دیموکراتەکان، وەکو لە لیستێکدا Freedom House ریزی کردوون، ئەوانەن کە کەمتر عارەبایەتیان تێدا کراوە[44]. هەرچەندە رۆژهەلاتی ناڤین وەکو کاکڵەی جیهانی موسڵمانەتی چاوی لێ دەکرێ (ئەوان خۆشیان هەروا دەبینن). کاری هاوچەرخانەی هەرە نوێکەرەوەو داهێنەرانە و پەرەگرتوو لەبارەی ئیسلام لە سەر سنوورو کەوشەنان کراوە، واتە لەو ولاتانەی وەك ئەندەنووسیا و کیومینتەی موسڵمانان لە رۆژئاوا، وایان لە چەند زانایەك کردووە بپرسن کە داخوا ناوەندی قورسایی ئیسلام ئێستا بەرەو ناوچەگەلی زۆر دینامیکی تر نەخزاوە[45]. لە فەسڵەکانی تردا کە کاکڵەی ئەم کتێبە پێکدێنن، زۆر بەدرێژتر دەچینە ناو وردەکارییەکانی ئەو هۆکارانەی کە ئیسلام و تەعبیرە سیاسییەکەی ئەم خەسڵەت و سیمایانەیان پێ داون لە ناوچەی جیا-جیای جیهانی موسڵمانەتیدا.

### دەوڵەتی - نەتەوە، هۆز و خێڵ

هەر وڵاتێ لە جیهانی موسڵمانەتیدا بگریت بەهۆی دابڕانی نێوان کۆمیونیتە ئیتنییەکان، خێڵەسات، هۆزەکـان کـە زۆر جـاران بنکـەی سـەرەکیی پێناسـەی تاکەکەس پێکدێنن و ماشـێنێکی سـەرەکی رەوتـاری سیاسـین، درزو کەلەبـەری تێدایە. هەندێ بێ چارەیی دەوڵەت لە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت بـۆ ئـەم راسـتییە دەگێڕنەوە کە سەرپۆشە دامەزراوەیی و بیروکراتییەکانی دەوڵەتی مۆدێرن بەسـەر هەردمی کۆمەڵایەتیدا لەسـەردەوە سەپێنراون کە پێکهاتـەی بـەهێزی هـۆزەکی و خێڵەکی دەپارێزن[46].

لە عیراقدا، بۆ نموونە، نزیکەی 150 خێڵەساتی بەبنەچەکە ماڵبات هەیە، کە هەندێکیان دەیان هەزار ئەندامیان هەیە. رژێمی سەدام تا رادەیـەکی گـەورە لـە ئاسـتی هـەرە بـاڵاو کاربەدەسـتدا لـە لایـەن خـزم و کەسـوکارەکانی سـەدام و ئەندامانی گروپێکی هۆزەکی- کە بە تکریتییەکان ئاماژەیـان بـۆ دەکـرێ- کـە خێڵی نەلبوناسرەو سەدام خۆی لەوانە، کۆنترۆڵکراوە. لەپشت هۆزەکانی تکریـت، زۆرێك لە خێڵەکانی تری سوننەی عیراق لەسایەی سـەدامدا موچـەی سـەرباریان هەبووەو دڵسـۆزییان بۆ رژێم نواندووە. سەرکردەی هۆزەکان زەوی، پارە و چـەك و دەسەڵاتیان بەسـەر خێڵ و هۆزەکانیان پێ درا. گەنج و خـورتی هێـزە دۆسـتەکان هـان دەدران بـچنە نـاو ریـزی سـوپاو ئـەمن و خێـرا پلـەیان بـەرز دەبـۆوەو پێشدەکەوتن[47]. جێگەی سەرسوڕمانێ نییە، ئەم سیاسەتە دوای عیراقـی سـەدام بەردەوامە و بە قووڵی بەهۆی دینامیکیـاتی هـۆزەکی و خێڵـەکی کاریگـەرییان لەسەر بووە. فیدراسیۆنی هۆزە سوننییەکانی دلێم، لە نزیکەوە هاریکاری رژێمی سەدام بوون بە تایبەتی لـە فەللوجـە، کـە ناوەنـدی هێـرش و پـەلامارە بۆسـەر هێزەکـانی هاوپـەیمانان. هەنـدێ جـار لـە ترسـی تۆڵـەی هـۆزەکی، وایـان لـە دەسەڵاتدارە تازەکانی عیراق کرد کە قانوون و نیزام جێبەجێ بکەن.

خێڵەکایەتی دیسان لە نیمـچە دورگـەی عـەرەب خـۆی پاراسـتووە، بـەپێی دیراسەیەکی ساڵی 1996، ئەندامانی هۆزەکەی سەرۆك عەلی عەبـدوڵڵا سـاڵح،

هۆزی سەنعان، 48%ی پۆستە سیاسییە باڵاکان و 70%ی پۆستە ئیدارییەکانیان لە یەمەن بەدەستەوەیە (Kostiner, 1996). لە ناوچەکانی پشتون-ی ئەفغانستان لە ئوستانی سنووری باکوری رۆژئاوای پاکستاندا، هەموو سیاسەتەکان خێڵەکییانەن. سەرکردایەتیی سیاسی بەشێوەیەکی نەریتئاسا لەلایەن سەرکردەی هۆزەکان یان مالیکەکانەوە بەڕێوەبراون. بەریتانیا سیستەمی ریعایەی رەسمی پێ بەخشیون و مولکایەتی بە دامەزراوەیی کرد بۆ کۆنترۆلکردنی هۆزەکانیان — ئەم سیستەمە تا ئەمرۆش لە ناوچەی خێڵەساتەکان لە پاکستان بەردەوامە. جیهادی ئەنتی سۆڤیەت لە هەشتایەکاندا بەشێوەیەکی ئوسولی بەلانسی سیاسیی ناوەکی گۆڕی لە ناوچەی پشتۆن بەهۆی بەهێزکردنی سەرکردە ئایینییەکان، یان مەلایەکان کە پاترونەکانی نێونەتەوەیی پاردو چەکیان بە موجاهیدەکانی ئەفغان دەدا. لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا، مەلایەکان رێگەیەکی درێژیان بڕی لە پێشنوێژی نەدارو هەژاری گوندان و بوونە سەرکردەی سیاسی کە رکابەری لەگەڵ مالیکە هۆزەکییە سوننەتییەکاندا، بکەن.

وەلائاتی بن-نیشتمانی، پێچەوانەیە لەگەڵ هێزی دامەزراوەگەلی نیشتمانی. نفووزی خێڵەکان سادەو سانا لە ترادیسیۆن پەیدا نەبووە، بەڵکە ئەوان خزمەت بە هاووڵاتیان دەکەن کە دەوڵەت ناکارێ بیانکا. لەئاکامدا، وەلانی هاووڵاتیان بۆ خۆیان رادەکێشن. سەختە دەوڵەت بکارێ بەبێ زۆرنواندن، نفووزو فرمانی خۆی جێبەجێ بکا، لەو ناوچانەدا کە دانیشتوان هیچ سوودو قازانجێکی بەرچاویان لە ئەندامەتی لە کۆمەڵەیەکی نیشتمانی دەست نەکەوێ[48].

لە دەوڵەتێکی هەڵوەشاوەو لەبەریەکترازاوی وەك سۆماڵ، وەلائی خێڵەکی هەموو شتێکە، بەڵام لە دەوڵەتێکی بەهێزی وەك تورکیا، شوناسی نیشتمانی هەندە بەهێزە کە سیستەمی سیاسی بتوانێت بەردەوام ببێ و سەرکەوتووانە سیاسەتگەلی بنەماگرتووی ئیتنی و ئایینی بەیەکەوە تێکەڵ بکا لە ماوەی 70 ساڵدا. لە ئەردەن و هەندێ دەوڵەتی کەنداودا، خێڵەسات کۆڵەگەی بنەڕەتی پاشایەتیی کۆنەپارێزە، لە وڵاتانی تردا، بەهەرحاڵ، نزیکبوونەوەی خێڵەکایەتی،

ئیسلامی سیاسیی رادیکاڵ، دەسەڵاتێکی کزو نابودی دەوڵەت، جۆرەها ئیسلامی سەرەڕۆ و تیرۆریزمی بەرهەمهێناوە. سیاسەتێکی کارای ئەمریکا دەرهەق یەکە یەکەی وڵاتان لە جیهانی موسڵمانەتی- یان لەهەر شوێنێکی تر- دەبێ وەلائاتی بن- نیشتمانی و پەیوەندیگەلی هێزەکان لەبەرچاو بگرێ. لە عیراق، تا ئەو دەمەی حکومەتێکی نوێنەرایەتی نیشتمانی پتەو دێتەدی، دەبێ دەسەڵاتەکان لە بەغدا، لەگەڵ سەرۆك خێڵەکاندا کار بکەن. هەروا دەسەڵاتێکی زۆر بە هەندێ شێخی خۆجێی بدرێ کە بۆ حکوومەتی ناوەندیێ زەحمەت دەبێ کۆنترۆڵی ئەو شێخانە بکا. مەترسی یاخیبوونی خێڵەکی لەئارادا دەبێ یان خێڵەکان هەوڵ بۆ فروانکردنی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی خۆیان لەسەر حیسابی حکوومەتی ناوەندی بدەن.

تێنەگەیشتنی تەواو لە سیاسەتگەلی خێڵەکی یەکێ لەو هۆیانەی کە بوودتە هۆی کارەسات لە دەخالەتکردنی ئەمریکا لە کێشەی سۆمالیا لە سەرەتای نەوەتەکاندا. دە ساڵ دواتر، حکوومەتی ئەمریکا هێشتا شتێکی کەم لەبارەی دابنامیکی خێڵەکی لە ناوچەکەدا دەزانێ کە هێزەکانی ئەمریکا کاری تێدا دەکەن یان لەوانەیە کاری تێدا بکەن. کە ئەمریکا سیاسەتێکی چالاکانە لە ناوچە بێ سەروبەرەکانی دنیادا بەڕێوە دەبا، کارێکی یەکلاکەرەوەیە کە ئەمریکا تێ بگا و فێر ببێ چۆن پرسگەلی بن-نەتەوەیی و خێڵەکی بەڕێوەدەبا.

### سەرچاوەکانی رادیکالیزمی ئیسلامی

لەچوارچێوەی فرەوان و گشتیی ئیسلامی سیاسیدا، رادیکاڵەکان کەمینەیەکی بەجیاهەڵکەوتوون، بەڵام کاریگەرییان هاوڕێژەی ژمارەیان نییە. ئەو فاکتەرانەی بوونەتە هۆی هەڵکشانی ئیسلامی سیاسی دەچنە ناو جۆری فرەوانەوە: هەلومەرج، پرۆسەو پێشهاتە کارەساتهێنەکان.

هەلومەرج وەکو زاراوە بەمانای: ئەو فاکتەرانە دێت کە خەسڵەتێکی هەمیشەیی یان نیمچە هەمیشەییان هەیە. هەلومەرجی سەرەکی لەو وڵاتانەی

که ئەم لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، ئەوەیە: چونکە ئەوانە وڵاتی زۆرینە موسڵمانن.- ئیسلام- یان لێکدانەوەی باوی ئیسلام، کولتووری ئایینی و سیاسی دیاری دەکا. بە زۆری ئەوانە ئاکامی کۆلۆنیالیزم و پاکتاوکردنی پرۆسەی کۆلۆنیالیزمن. دوای سەربەخۆیی، زۆربەی ئەو وڵاتانە مۆدێلگەلێکی سیاسی و ئابووریی ئەوتۆیان جەڕباند کە نەشیان گەشەکردنێکی ئابووری فەراهەم بکەن یان دامەزراوەگەلی نوێنەرایەتی سیاسی بەردەوام پێکبهێنن. بێ مایەدەرچوونی ئەم مۆدێلانە، بوونە هۆی ئەوە کە مۆدێلی ئیسلامی بێتە گۆڕێ، —چەمکی — ئیسلام چارەسەرە. هەلومەرجێکی تر کە ڕێگەی بۆ سەرهەڵدانی سەرڕۆیی ئیسلامی خۆشکرد ستراکتوری ئەنتی رۆژئاواییە. تەوژمێك کە خەڵکی نائومێدی خۆیان بکەنە دەرێ سەبارەت هەلومەرجی دژواری ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆیان کە هەست دەکەن هیچ چارو مەفەرێکیان بۆ گۆڕینی ئەو هەلومەرجە نییە، وە هەندێ سیماش کە لە ناو ئیسلامی سوننەگەرادا هەیە، وا دەکەن پیاوانی ئایینی، بەئاسانی خەڵکی لە دەوری ئەجێندای رادیکاڵ کۆبکەنەوەو بۆ قازانجی خۆیان بەکاریان بهێنن.

پرۆسەکان بریتین لەو پەرەسەندنانەی کە لەماوەیەکی درێژدا روودەدەن و بەرهەم و ئەنجامێکی تایبەتی یان بارێکی هاوسەنگیان هەیە. ئەو پرۆسانەی کە لە چوارچێوەی هەلومەرجی ناوچەیەکدا روودەدەن و لەوانەیە هاوکات بن لەگەڵ رووداوگەلی کارەساتباردا. کێشەی ئیسرائیل — فەلەستینییەکان و کێشەی کشمیر پرۆسەن.

رووداوی کارەساتبار، پەرەسەندنی سەرەکی ئەوتۆن- شەڕ یان شۆرش- کە هێزە بزوێنەرەکانی سیاسی دەگۆڕێ یان وڵات دەخاتە سەر بارێکی ئوسوڵی. نموونەی هەلومەرج، پرۆسە، رووداوی کارەساتبار کە پێوەندییان بەم لێوەکۆڵینەوە هەبێ، لە خشتەی ژمارە (0-3)دا خراوەتە روو.

**هەلومەرجەكان:**

مۆدێلی سەرنەكەوتووی سیاسی و ئابووری:

ئەو هەلومەرجەی كە لەوانەیە زێتر لە هەر یەكێكی تر ڕەنگرێژی ژینگەی سیاسی لە جیهانی موسڵمانەتی و جیهانی عەرەبی بەتایبەتی كردبێ، مۆدێلی ژێركەوتووی بەربڵاوی سیاسی و ئابوورییە لە دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی. دیارە زۆرێك لەو نەخۆشی و دەردانەی كە تووشی ئەو وڵاتانەی ئەم بەشەی جیهان بوونە و سەرەڕۆییان لێ دەكەوێتەوە، لەم مۆدیلە فاشیلە ئابووری و سیاسییانە كەوتوونەتەوە.

لە سەردەمی هەرە زووی باڵادەستی ڕۆژئاوادا، بزووتنەوەی سیاسیی ئەوتۆ هەبوون كە ڕووبەڕووی بەهای ڕۆژئاوا و نفووزی سیاسیی ڕۆژئاوا دەبوونەوە. هەندێ لەم بزووتنەوانە، بنەمای ئیسلامییان هەبوو، ڕاستەوخۆ دوای قۆناخی كۆلۆنیالی، بزووتنەوەی هەرە بە نفووزو كارای دژ بە بوونی ڕۆژئاوا لە جیهانی موسڵمانەتیدا، بزووتنەوەی عەلمانی بوون كە بڕوایان بە هەندێ شێوەی ئایدیۆلۆجی سۆسیالیستی هەبوو، سۆسیالیزمی عەرەبی ناسری، حزبی بەعس، موسەدەق و حزبی تودە لە ئێران. فەتح و گروپە بچووكە سەرو سەمت ماركسییەكانی فەلەستین، بەرەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی جەزایر، ناسیۆنالیزمی ئەندەنووسیی ماركە سۆكارنۆیی. ئەم ڕژێم و ئایدیۆلۆجیانە، نەشیان سەركەوتووانە بەڵێن و گفتی نەشونمای ئابووری، عەدالەتی كۆمەڵایەتی، هێزو بڕستێكی نێودەوڵەتی بهێننە دی.

لە سەردەمی دوای كۆلۆنیالی، ئەزموونە سیاسییە سەرنەكەوتووە هەرەنامێیەكان، چەند ڕژێمێكی نا نوێنەر، گەندەڵ و داپڵۆسێن كە نەشیان ژینگەیەك بۆ دیموكراسی، خۆشگوزەرانی ئابووری و دادپەروەریی كۆمەڵایەتی ساز بكەن. ئەمە لە ڕاپۆرتی ساڵی 2002ی بەرنامەی بوژانەوەی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ پەرەپێدانی كۆمافی مرۆڤی عەرەب دەردەكەوێ، نامەیەكی تۆمەتی نا ئاسایی لەبارەی كەموكوڕی ڕەگناژۆ لە بنیادی دامەزراوەگەلی عەرەبی.

باشە تێبینی ئەوەش بکرێ، هەر چۆنێك بێ، فەشەلی سیاسی و ئابووری، لەسەرانسەری جیهانی موسڵمانەتیدا گشتگیر نییە. ئەردەن و مەغریب و هەندێ دەوڵەتی کەنداو، هەندێ دامەزراوەی نوێنەرایەتی کەم تا زۆریان بۆ خۆ پێکهێناوە. میسرو عیراق، سیستەمی پەرلەمەنتاری، ئەگەرچی نیوەناچڵیش بوو، بەر لەرووخاندنی پاشایەتی لەو دوو وڵاتە، لەئارادا هەبوو. شایانی گوتنە لەمبارەوە، پاشایەتی موسڵمانەتی، بەگشتی فرەیی سیاسیی گەورەتر، ئەقڵانیەتی ئابووری، ئەگەری پێشکەوتنی دیموکراتی تێدایەی لەچاو "کۆمارەکان" کە لە هەندێ جێگەدا جێگەیان گرتوونەتەوە. تورکیا رێچکەیەکی جیای گرت. هەر لەزووەوە لە دامەزراندنی کۆمارێکی عەلمانی بەئاشکرا لە 1923-ەوە و نیو سەدە ئەزموونی لە دیموکراسیی پەرلەمەنتاری هەیە، هەڵبەتە بە مایەی خۆتێکردنی میلیتاریانەی ناوە بەناوەوە. سەمتی سەرەکی لە پەرەسەندنی سیاسی لە زۆربەی دەوڵەتی زۆرینە- موسڵماندا لە رۆژهەڵاتی خوارووی ئاسیا دیسان، رەنگ و رووێکی دیموکراتانەی هەبووە. مالیزیا لەوەتەی سەربەخۆیی وەرگرتووە، سیستەمی پەرلەمەنتاری هەیە، ئەندەنووسیا لە دوای بەکۆتاهاتنی سەردەمی سۆهارتۆوە، دووەمین هەڵبژاردنی ئازادانەی کردووە.

### دژە- رۆژئاواییبوونی بنیادی

ئیسلامی سیاسیی رادیکاڵ تا رادەیەکی زۆر حاڵەتێکی دژە- رۆژئاوایی و بەتایبەتی دژە ئەمریکایی وەرگرتووە. راڤەکردنی تووڕەیی موسڵمانان لە ئەمریکاو رۆژئاوا دوو رووی شیکاری و ئایدیۆلۆجی هەیە: لە لایەکەوە ئەو تێڕوانینەیە کە هۆی تووڕەیی موسڵمانان لە سیاسەتگەلی ئەمریکا بریتیە لە: بە تایبەتی پشتگیری ئەمریکا بۆ ئیسرائیل و رژێمە ستەمکارەکان، حزووری سەربازی ئەمریکا لە عەرەبستانی سعودی، ئەفغانستان و ئێستاش لە عیراق. سەپاندنی ئابلوقەی ئابوری و ناوچەی دژە-فڕین بەسەر عیراقدا لە دوای شەڕی کەنداوی ساڵی 1991یش، بە هۆیەکی تووڕەبوونی موسڵمانان دادەنرێ.

بەهەرحاڵ، وا دەردەکەوێ پێوەندییەك نەبێ لە نێوان هەڵکشان و داکشانی سیاسەتگەلی ئەمریکا لە سەردەمی جیاجیادا کە لەگەڵ بەرژەوەندەکانی موسڵماناندا کۆك بووە (پشتەوانی ئەمریکا بۆ موجاهیدان لە شەڕی ئەفغانی، دەخالەتی ئەمریکا لە بۆسنیا و کۆسۆڤۆ بە قازانجی موسڵمانەکان، رزگارکردنی کوێت) و ئاستی هەستی دژە-ئەمریکایی. بە واتایەکی تر، پشتەوانی ئەمریکا بۆ موسڵمانە ستەملێکراوەکان، وێدەچێ کاری لە هەڵوێستی موسڵمانان نەکردبێ، جگە لەو وڵاتانەی کە دەخالەتی ئەمریکا کاریگەرانە بووە- بۆ نموونە لە کوێت و بۆسنیا[49].

تێڕوانینێکی دیکە هەیە کە پێیوایە تووڕەیی موسڵمانان رەگوریشەیەکی قوڵتری لەناو بنیادی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەندێ وڵاتی موسڵمان هەیە و دژایەتیکردنی سیاسەتگەلێکی دیاریکراوی ئەمریکا ناوەرۆکی ئەم تووڕەییە دیاری دەکاو دەرفەت بۆ دەربڕینی دەکاتەوە. ئەمە بەو مانایە نییە کە زۆر لە موسڵمانان ناڕەزایەتی لە سیاسەتگەلی ئەمریکا دەرنابڕن، بەڵێ ئەوان وا دەکەن، بەڵام سەرچاوەکانی ئەم تووڕەییە قووڵترن. ئەمە ئەوەیە کە ئێمە بە دژە-رۆژئاوابوونی بنیادی یان دژە ئەمریکابوونی بنیادی ئاماژەی بۆ دەکەین. ئەمە لە باری ئوسوڵییەوە لەو جۆرە دژە-ئەمریکابوونە جیایە کە لە ئاکامی نارەزایی لە سیاسەتگەلێکی ئەمریکایی کە بکرێ لە رێگەی دەستاوێژی سیاسی یان دیپلۆماسی گشتییەوە چاك بکرێتەوە.

بەپێی ئەم تێڕوانینە، سەرچاوەی ئەم تووڕەییە بریتییە لە شۆك و دەردی جیهانی موسڵمانەتی لە مۆدێرنیتە، داوەشان و لەجێچوونی جڤاکی و ئابووری کە لە بەمۆدێرنکردنی فاشیلانە کەوتووەتەوە. نەبوونی کەناڵی دامەزراو بۆ دەربڕینی نارەزایی سیاسی. ئەم تووڕەییە ئاراستەی رۆژئاواو و ئەمریکا بەتایبەتی کراوە، چونکە وەکو هۆکارێکی سەرەکی گۆڕانکاری جیهانی، ئەمریکا نوێنەرایەتی ئەو هێزانە دەکا کە، لەدیدی هەندێ لە موسڵمانانەوە، وڵاتەکانیانی لە پێگەیەکی نزمتر داناوە لە چاو رۆژئاوا و هەڕەشە لە یەکێتی جیهانی موسڵمانەتی و بەهاکانیان دەکات.

هەروا دژە- رۆژئاوایی بنیادی لـەوەوە دێ لـە ڕێگەیـەکی ئارەزووخوازانـەی زێترەوە کاتێ حکوومەت و نوخبەی سیاسـی لەو وڵاتانەی کە سیستـەمی سیاسیی سەرنەکەوتوویان هەیە (کە هەندێکیان وەلائیان بـۆ ئـەمریکا هەیـە) دەیانـەوێ رووی نارەزایی دانیشتوانی وڵاتەکانیان وەربگێڕن کاتێ ئاگری پرۆپاگنـدەی دژە- ئـەمریکایی و دژە-جولەکایـەتی خـۆش دەکـەن. وەك ئـەو حاڵەتـەی کـە پێشێلکردنێکی گەورەی لە رۆژئاوا لێکەوتەوە، بەرهەمی تەلـەفزیۆنیی میـسری سوارێك بەبێ ئەسـپ، کە سیماکانی پیرەکانی زایۆن، بە فابریکەسـازی قەیـسەری دژە- سامی دانا. ئەم بەرهەمە بە زنجیرە لە 20 تۆڕو کەناڵی تەلەفزیۆنی عەرەبی لە رەمەزانی 2002 لێدرایەوە.

## بەناوەندی نەکردنی دەسەڵاتی ئایینی لە ئیسلامی سوننەگەرادا

یەکێ لەو هۆکارانەی وای کردووە ئیسلامی سوننەگەرا قایم نەبێ لە هەمبەر بەکارهێنان و مۆبالیزەکردندا بریتیە لە نەبوونی میکانیزمگەلێکی دامـەزراوەیی لەناو ژێرخانی ئایینی بۆ کۆنترۆڵکردنی سەرەڕۆیەکان. بە پێـچەوانەی ئیـسلامی شیعەگەر، لە سەدەی نۆزدەوە هەرەمێکی پلە بەپلەی ئـاییـنی بـۆ خـۆی دانـاوە، دەسەڵاتی ئایینی ئیسلامی سوننەگەر بەناوەند نەکراوە. بەگـشتی، لێکدانـەوەی ئـاییـنی لـە لایـەن عولەماکانـەوە ئەنجامـدەدرێ، ئـەم ئەرکـەی خۆیـان بـە سەربەخۆییەکی زۆرەوە لە دەسەڵاتی سیاسی بەپێی وڵات، ئەنجام دەدەن.

زانایانی ئایینی بەشێوەیەکی رۆتینی فەتوا دەردەکەن، واتە ئـەحکام لەسـەر شەریعەتی ئیـسلامی. تاکەکەسـان بـەبێ راهێنـانی شـکڵی یـان دەسـەڵاتێکی ئایینیی دانپیانراو ڕێگەیان پێ نـەدراوە فـەتوا بـدەن، بـەڵام سروشـتی نـاڕوونی دەسەڵات لە ئیسلامی سوننەگەردا بوارێکی گەورەی کردۆتەوە بـۆ کۆنتراکتـەری ئایینی کە ئامانجە سیاسی و کەسایەتییەکانی خۆیـان بـەناوی دیـن پێـشکەش دەکەن. ئوسامە بن لادن نموونەیەکە لەوانە بەبێ راهێنان و پەروەردەی ئایینی یان دەسـەڵات لەگـەڵ ئەوەشـدا بووەتـە سـیمبولێکی ئـاییـنی و ئیلهامبـەخش بـۆ لێکدانەوە سەرەڕۆیەکەی بۆ ئیسلام.

## بێ دەنگی میانڕۆیەکان

سـەرەڕۆیەکان دەشـێن نفـوزێکی نابـەجێ پـەیڕەو بکـەن چـونکە بـەزۆری میانڕۆیەکان حەزیان لێ نییە رووبـەرووی سـەرەڕۆیەکان ببنـەوە. هۆیـەکی ئـەم خۆدانە پاشە، بریتییە لە دەسەپاچەیی ئایدیۆلۆجی کـە هـەمان بـەهاو باوەڕیـان هەیە. زانایەکی ئیسلام ئەم رێگایەی داناوە "کاتێ یەکێ تیـشکۆ دەخاتـە سـەر باوەڕە ئوسولّییەکان، بەها شانازی پێکراوەکانی خۆیان، جۆری کۆمەڵگـە و ئـەو نیزامـە سیاسـییەی ئـەوان دەیانـەوێ دروسـتی بکـەن، میانڕۆیـەکان زۆرشـتی هاوبەشیان لەگەڵ رادیکاڵەکاندا هەیە تا لەگەڵ دیموکراتخوازە سـەمت و رەنـگ و روو رۆژئاواییەکان".

هەروا ترس و خۆفیش لە ئاکامەکانی دەرگـیری لەگـەڵ رادیکالـەکانیش لـە ئارادایە. لە زۆر شوێنی جیهانی موسڵمانەتیدا، رادیکاڵەکان بەگشتی توانیویانە سەرکەوتوو بن لە پاکانەکردن بـۆ تیرۆریـزم وەك بەشـێك لـە خـەبات و ململانـە لەنێوان ئیسلام و رۆژئاوادا. هەندێ لە موسڵمانە میانڕۆیەکان لەوە دەترسـن کـە بە راشکاوی بەرەنگاری رادیکاڵەکان ببنەوە، نەبادا بەکرێگرتەی بەرژەوەنـدەکانی رۆژئاوایان حسێب بکەن. بێزهاتنەوە لە بەرەنگاری رۆلێك دەگێـرێ. هەنـدێ لـە میانڕۆیەکان، وێرای ئەوەی کـە لەگـەڵ رێنـوێنی و میتـۆدی رادیکالـەکان یـەك ناگرنەوە، دەبێ بە برادەرێکی موسڵمانیان بزانن و لەگەڵیاندا بکەوینە دیـالۆگ و هەوڵی ئیقناع پێکردنیان بدرێ لە جیاتی بەرەنگاربوونەوەیان[50].

### پرۆسەکان:

### رابوونی ئیسلامی

لـە سـەرەتای حەفتاکانـەوە، زۆرێـك لـە جیهـانی موسـڵمانەتی رێـچکەو تەوژمێکیان ئەزموناند کە بە ئیسلامیکردنەوە، یان رابوونی ئیسلامی ناو دەبرێ. ئەم دیاردەیە دەناسرێتەوە بە دینداری، جەختکردنەوەی زێتر لەسەر روالەتـەکانی خواپەرستی وەك جوبەو حیجابی ئیسلامی، لێجیاکردنـەوەی کۆمەڵایـەتیی ژن و

پیاو، خۆبەستنەوە بە قەیدو قیودی ئیسلامی، لێ نەبوردن لە رەوتاری گشتیی نائیسلامییانەی وەك ئارەق خواردنەوە لە کۆڕی گشتی، سیاسەتگەلی سازشکارانە لەسەر پێناسە[51]. موسڵمانە میانڕۆیەکان جەخت لەسەر رووە تەندروستەکانی بەئیسلامیکردن دەکەنەوە، کە لا لێکردنەوەی گەورەتر بە رێنوێنییە ئەخلاقییەکانی ئاین هان دەدەن، خیتابێکی زۆر چڕوپڕتر، رەخنەی ناوخۆیی سەبارەت بەهەلومەرجی ئیسلام. بەهەرحاڵ ئەم پرۆسەیە، لایەنگەلی زیانبەخشی هەیە، وەك نا لێبوردەیی زۆر، سەرەڕۆیی سیاسی، بڵاوکردنەوەی زەبروزەنگ لەناو هەندو کەرتی موسڵماناندا.

لەبەرکردنی پۆشاکی ئیسلامی لەو کۆمەڵگایانەی کە بەگشتی ئەم پۆشاکە لەبەر ناکەن، ئاماژەیەکە کە تا چەند بەئیسلامیکردن لەو ناوچانەدا پێشکەوتووە وەك نیمچە بیابانی ئەفریقیا، خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا و تەنانەت لە تورکیاشدا. لە هەندێ کۆمەڵگەی عەلمانیی جیاوازیشدا وەك سەنگافورەو فەرەنسا، لەبەرکردنی حیجاب لە قوتابخانە تایبەتییەکاندا، نەبەردی سیاسی لێ کەوتووەتەوە لەنێوان موسڵمانە بەدینەکان کە داوای ئازادی دەربڕینی ئایینی دەکەن و دەسەڵاتە عەلمانییەکاندا کە دەیانەوێ تێڕوانینی خۆیان بۆ پەروەردەی عەلمانی و توندوتۆڵی کۆمەڵایەتی جێبەجێ بکەن.

### بەعەرەبکردنی جیهانی غەیرە نا موسڵمان

لە وڵاتانی دەرەوەی رۆژهەلاتی ناڤینی عەرەبدا، رابوونی ئیسلامی، ئایدیۆلۆجیا و رێورەسمی ئاین بەجێ گەیاندن، سەلوات و حەمدو سەنا، زاراوەسازی، تەنانەت تەلارسازیی مزگەفتی بەبنەچە عەرەبی هاوردووە- ئەو پرۆسەیە، ئێمە بە تەعریب ئاماژەی بۆ دەکەین. ئەم پرۆسەیە کاریگەرییەکی جەمسەربەندی هەیە لە دەرەوەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، مەودایەکی گەورەتری دروستکردووە لەنێوان ئەو موسڵمانانەی کە توخمگەلێکی کولتووری ئایینیی عەرەبیان هەلبژاردووە وەك شێوازێك بۆ دەربڕینی خواپەرستانەی زێتری خۆیان و،

لەگەڵ ئەو غەیرە دین و موسڵمانانەشدا کە دەقیان بە رێورەسمی خۆجێی و پراکتیکی ئایینی گرتووە.

تا چەند بەعەرەبکردن رەگی لەناو ئەو وڵات و ناوچانەدا داکوتاوە کە ئەم پرۆسەیان تێدا بەڕێوەدەچێ، پشت بە ژمارەیەك هۆکاری دەرەکی و ناوەکی دەبەستێ. پارەو پولی کەنداو، ماشێنێکی گرنگی ئەم پرۆسەیەیە. فاکتەرەکانی دی، ئاستی بەرەنگاریی کولتووری و سیاسیی و ئاشنایی (یان متوونەبوون)ی خەڵکی خۆجێ بە کولتوورو ئایینی عارەبان. بەتایبەتی لەمبارەوە پاکستان زۆر هەستیارە. زوو، لە سەرەتای حەفتاکاندا، حکوومەتی زولفەقار عەلی بۆتۆ چالاکانە برەوی بە زمان و خوێندن بە زمانی عەرەبی دا وەك بەشێك لە سیاسەتی دروستکردنی ناسنامەی "رۆژهەڵاتی ناوەڕاست" بۆ پاکستان. ئەم سیاسەتە لە دوای وی، لە سەردەمی جەنەراڵ زیائولحەق دا بەتاو و گوڕ بوو. وەکو گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی لە راپۆرتی خۆیدا لەبارەی پاکستان تێبینی کردووە، پارەو پول، کولتوور، سەرمایەی سیاسیی عەرەبی "بەرێژەیەکی زۆروزەبەند لە کایەی جیهادی ئەفغانیدا"[52] هاتووە. بۆ بەراورد، لە ئاسیای ناوەڕاستدا، کاریگەریی بان ناوچەیی هەرە دیار، کاریگەریی تورکیایی بووە نەك عەرەبی[53]. لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیادا، کاریگەریی عەرەبی هاوڕێ بووە لەگەڵ خەبات و تێکۆشانی سیاسی. پێوەندیی حەزرەموتی (یەمەنی) بە رادیکالیزمی ئیسلامی لە سەرانسەری ناوچەکەدا هەیە. زۆر لە ئەندەنووسییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە سەرەڕۆیی ئیسلامی لە وڵاتی ئەواندا پێوەندی بە پیاوانی ئایینیی بەبنەچەکە عەرەبەوە هەیە، بۆ نموونە، رابەری جیهادی لاسکار، جەعفەر عومەر تالیب، دامەزرێنەرانی کۆمەڵی ئیسلامی ئەبوبەکر بەئاسیر و عەبدوڵڵا سەنگار (مردووە)، سەرۆکی بەرەی دیفاعی ئیسلامی، موحەمەد حەبیب ریزیق[54].

**دیپلۆماسیی واقیعی: پارەپێدان و بڵاوبوونەوەی فەندەمێنتالیزم و پەڕگیری**

پارەوپولی سعودی و هەناردنە دەرەوەی جۆری وەهابیانەی ئیسلام، لە سێ دەیەی رابردوودا، بمانەوێ و نەمانەوێ، کاریگەریی هەبووە لەسەر بردوودان بە نەشونمای پەڕگیریی ئایینیی لەسەرانسەری جیهانی موسڵمانەتیدا. لەوەتەی پاشایەتی لە عەرەبستانی سعودی دامەزراوە، شێوەی وەهابی، شێوەی رەسمیی لێکدانەوەیە بۆ ئیسلام لەو وڵاتە. بەخشینەوەی پارەوپول بە رادەیەکی زۆر بۆ درێژەدان بە چالاکییە ئاینییەکان لەو دیو دەریاکاندا، خەسڵەتێکی بەرچاوی سیاسەتی سعودیەیە لە شەستەکانەوە. لە ساڵی 1962دا، "رابطة العالم الاسلامي" بەسەرۆکایەتیی موفتی عەرەبستانی سعودی، محەمەد ئیبراهیم ئال ئەلشێخ، وەچەی ئیبن عەبدولوەهاب، دامەزراوە. کاری ئەم "الرابطة"یە بڵاوکردنەوەو برەودان بووە بە تەرزی سعودییانەی ئیسلام لەسەر ئاستی دنیا. هەروا کاری ئەوە بووە سەلەفییە وەهابییەکان و غەیرە وەهابییەکان لێك نزیك بکاتەوە. ئەنجوومەنی دامەزرێنەری ئەم رێکخراوە، چەندین کەسایەتیی سەرکردەو بەرچاوی سەلەفی تێدایە، وەکو سەعید رەمەزان، زاوای حەسەن ئەلبەننای دامەزرێنەری ئیخوانولموسلمین، مەولانا ئەبو ئەعلای مەودودی دامەزرێنەری کۆمەڵی ئیسلامی لە پاکستان، مەولانا ئەبولحەسەنی نەدڤی هیند .(Algar, 2002)

رایەڵێکی تری وەهابی تۆڕی جیهانیی، کۆمەڵەی قوتابیانی موسڵمانە لە ئەمریکای باکوور و کەنەدا، کە لە ساڵی 1963دا دامەزراوە، واتە ساڵێك دوای دامەزرانی "الرابطة". ئەم دووانە پێوەندییەکی قووڵیان بەیەکەوە هەیە. هەماهەنگی نێوان کۆمەڵەی قوتابیانی موسڵمان و رێکخراوە هاوشێوەکانی لە وڵاتانی تردا بووە هۆی هاتنەکایەی فیدراسیۆنی ئیسلامیی جیهانیی رێکخراوەکانی قوتابیان لە ساڵی 1966دا. ئەم رێکخراوە پێوەندییەکی نزیکی لە گەڵ "الرابطة" و کۆمەڵەی جیهانیی لاوانی موسڵماندا هەیە کە بنکەکەی لە ریازە. ساڵی 1973، کاتێ ئابلووقەی نەوت بووە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت

و پارەوپولێکی زۆری نەوت (پیترۆدۆلار) بەسەر ولاتانی کەنداوی فارسدا باری، کە بووە هۆی پارەوپولدان بە ئاراستەو سەمتی فەندەمێنتالیستی جیهانی.

سعودییەکان بۆ بلاوکردنەوەی وەهابیزم بەشێوەیەکی کارامە پارەوپولیان وەگەڕخست بۆ کۆمەککردن بەو کۆمیونیتانەی بەهۆی شەڕەوە پلیشابوونەوە. ئاژانسە کۆمەکبەخشەکانی سعودی کاریان داوودەرمان و خۆراك ناردن، مزگەوت و قوتابخانە و شیلتەرات دروستکردن بووە. بەلام ئەم کۆمەکە بێ بەرانبەر نەبووە. لە دوای کێشەو هەرای بالقان لە نۆهەتەکاندا، ئاژانسە کۆمەکبەخشەکانی سعودی، سەرباری قوتابخانە، بنکەی تەندروستی و شیلتەر دروستکردن- ژمارەیەك مزگەوتی سەردەمی عوسمانلی، کتێبخانە، گۆڕستان و بنیاتگەلی ئیسلامی تریان تێکدا یان شێواند کە لە دوای ململانەو توندوتیژی مابوونەوە لە بۆسنیاو کۆسۆڤۆ.

هەروا تەواو بەبێ ئارەزووی سعودییەکان، سەروەت و داهاتی نەوت بۆ قازانجی پەڕگیرو سەرەڕۆی ئیسلامی بەکارهات کە سەرمایەگوزارییان لەسەر لێکهەلوەشانی کۆمەلایەتی و گەندەلی دەکرد کە لە ئابووری نەوت کەوتۆتەوە بۆ بەهێزکردنی تێڕوانینی رادیکالانەی خۆیان. دوو پێشهاتی سالی 1979، ئاسایشی عەرەبستانی سعودییان خستە بەر هەڕەشەوە: شۆرشی ئیسلامی لە ئێران و دەسگرتن بەسەر حەرەمی شەریف لە مەککە لە لایەن بەرهەلستکارە سعودییەکانەوە. شۆرشی ئێران، لەنێو چەندین کاریگەریی تردا، کێبەرکێیەکی ئاگرینی لەنێوان تاران و ریازدا هەلایساند بۆ تەئسیرکردنە سەر جیهانی موسلمانەتی. سعودییەکان لە رووی پارەو پولەوە بالادەست بوون و هەروا لە هەر دوو مەزاری پیرۆزی موسلمانان-یش بەرپرسیاربوون، خومەینییەکان-یش بە حەماسەت و تین و تاوی شۆرشگێرانە و بانگراهێلان بۆ "موستەزعەفان" کە لە هزری دامەزراوەکانی شیعەی شۆرشی ئێرانی تێپەراند.

دەسگرتن بەسەر حەرەمی شەریفدا لە لایەن پەڕگیرە سعودییەکانەوە لە پێشاژۆی ئەم کێبەرکێیە ئایدیۆلۆجییەدا روویدا. ئەم دەسبەسەراگرتنە لە ناخەوە

پاشایەتیی سعودی راهەژاند. حکوومەتی سعودییە رابەرانی ئەم کردەوەیەی لە سێدارە دا، بەڵام بەکردەوە هەندێ لە ئەجێندای ئەوانی پەسند کرد. سعودییەکان لە ناوەوەی وڵاتدا، بەرفرمانی ئایینییان توندتر کرد و بە ئەنجامێکی گەورەترەوە، هەنگاویان بۆ پارەدان بە مزگەوت، مەدرەسەو حوجرە، نایەوە، رێکخراوەگەلی بەختیاریی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی لە وڵاتانێکی وەك پاکستان، ئەو بۆشاییەیان پڕکردەوە کە لە ئاکامی دامەزراوەی ناکارای دەوڵەتی یان نەبوونی دەزگای لەمبابەتە، هاتبووە کایەوە.

هەڵبەت، هیچ میکانیزمێك نەبوو بۆ دابەشین و خەرجکردنی "پارەی سعودی". ئەم پارەیە لەسەرچاوەی گشتی و تایبەتییەوە دەهات و کەناڵیزە کرابوو لە رێگەی دامەزراوەی جیا-جیاو پێناودا بۆ "سوودمەندان" لە سەرانسەری جیهاندا. لە هەندێ باردا، سوودمەندان ئەوانە بوون کە مەبەست بوون، بەڵام هەندێ جاریش وا خۆیان دەشاردەوە کە زۆر جەزابیتر بوون بۆ پارەپێدەران.

سەختە جەخت لەوە بکرێتەوە کە تا چ رادەیەك پارەدەران بەناگابوون کە ئەو پارەیە دەکەوێتە دەست کێ و تا چەند جێگەی خۆی دەگرێ، لێ بەڵگەی جەوهەری و جیددیش هەیە کە بەشێکی ئەم پارەیە کەوتۆتە دەست گروپگەلی سەرەڕۆ و تیرۆریست. هەولوتەقەلا بۆ دامەزراندنی دەزگاو ئاژانسی لێپێچانەوە کزو لاوازە یان هەر لەبنەڕەتدا نەبووە، یان ئەوەتە لەبەر ئەولویەتی نزمی پارەدەران یان لەبەر نەبوونی میکانیزمگەلێك بۆ چاوەدێریکردنی بەکارهێنانی ئەو پارانە.

دیاهی، دەرکەوت کە زۆر سەختە بۆ دەسەڵاتگەلی سعودی رێگە لە پارەدان بە گروپگەلی تیرۆریستی بگرێ. "مؤسسة الحرمين" تاوانبار کرا کە پارەی بە قاعیدە داوە. لە سۆنگەی ئەمەوە دەسەڵاتدارانی سعودی رێنوێنی ئەو دامەزراوەیان کردووە کە بوون و چالاکی خۆی لە دەرەوە بە شێوەیەکی زۆر کەمبکاتەوەدو تەنیا کار لەسەر پارەدان بەو چالاکییانە بکا کە لەناو سعودییەدا بەرێوەدەچن. لە ئایاری 2003دا، "المؤسسة" رایگەیاند کە ئۆفیسەکانی خۆی لە ئەلبانیا، بۆسنیا، کرواتیا، ئەتیوبیا، ئەندەنوسیا، کینیا، کۆسۆڤۆ، پاکستان، تەنزانیا داخستووە.

بەپێی راپۆرتی میدیاکان، داخستنی ئەم ئۆفیسانە لەسەر رێنوێنی و راسپاردەی وەزیری کاروباری ئیسلامیی سعودی سالح ئەلشێخ بووە و ئیدارەیەکی تازەی بۆ بۆردی "مؤسسة"کە دامەزراندووە[55]. لە حوزەیرانی 2004دا، کاربەدەستانی سعودی و ئەمریکایی، لە کۆنفرەنسێکی رۆژنامەوانیدا، لە واشینتۆن دی سی، رایانگەیاند کە "مؤسسة الحرمين" و رێکخراوگەلێکی تری خێرخوازی تایبەتی دەبێ خۆیان هەڵبوەشێننەوە یان لەژێر سەرپەرشتی دەستەیەکی نیشتمانی بۆ کاری خێرخوازی لە دەرەوە کاری خۆیان بکەن. ئەم دەستە تازەیە دەسەڵاتی تەواو و بێ ئەملاو ئەولای هەیە بەسەر هەموو چالاکییە خێرخوازییەکانی سعودی لەو دیوی دەریاکانەوە[56].

## نزیکایەتی رادیکالیزمی ئیسلامی و عەشیرەتگەری

کولتووری خێڵەکی و ئینتیمای خێڵەکی دەتوانێ دەورێکی بنەرەتی بگێرێ کە تا چەند شێوەگەلی رادیکاڵ و توندوتیژی ئیسلامی لە هەندێ ناوچەی رۆژهەڵاتی ناڤین و خوارووی ئاسیا گەشە بکەن. هەرچەندە نووسین و باس و خواس لەبارەی پێوەندیی نێوان عەشرەتگەری و رادیکالیزم بەباشی نەهاتۆتەئارا، لێ دیتنی ناوچەکەو بەڵگەی دەگمەن نیشانی دەدەن کە سەروسەمت و تەوژمی پەرگیر وێدەچێ زەوینەیەکی بەپیت و فرەی لە کۆمەڵگەی خێڵەکی بنەماڵەیی دەستکەوێ[57]. وەهابیزم کە تا ئێستەش دیاریدەیەکی خێڵەکییە، بانگەشە لە ناوچە شارنشینەکاندا یان کۆمیونیتەی کشتوکاڵیی داوەریودا دەکا. ئەو ناوچانەی بە مەکۆی بەهێزی قاعیدە دادەنرێن، ناوچەی خێڵنشینن: ناوچەی سەرسنووری نێوان سعودیە- یەمەن، خوارووی رۆژهەڵاتی ئەفغانستان، ناوچە فیدراڵییە خۆبەرێوەبەرە-خێڵەکییەکان لە پاکستان. زۆرینەی رفێنەرەکانی 11ی سپتێمبەرو، بن لادن خۆی، ئەسڵ و فەسڵی بنەماڵەییان دەگەرێتەوە بۆ ئوستانی رۆژهەڵاتی سعودی- یەمەنی. خالید شێخ محەمەد، پلاندانەری هێرشەکانی 11ی سپتێمبەر، برازاکەی رەمزی یوسف، کە دارێژەری پلانی بۆمبارانکردنی تاوەری

بازرگانیی جیهانی و تەقاندنەوەی هێڵی 12 کەسی لە هێڵی ئاسیا - ئەمریکا لـە 1995 بوو، لە بلووجەکانی پاکستان بوون. سێ بلوجەکـەی تـر کـە خزمایـەتیان لەگەڵ یوسف هەبوو وەکو سێ کەسایەتی دیارو سەرەکی قاعیـدە ئاماژەیـان بـۆ کراوە[58]. رایەڵکەو پێوەندیی خێڵەکی کە پاشماوەکانی قاعیدەو تاڵیبـان لەسـەر سنووری ئەفغانستان- پاکستان و بەلایـەنی زۆرەوە یـاخیبوونی عیراقـیش وەکـو سەرچاوە سودیان لێ وەردەگرن.

ئەم دیاریدەیە کە بەهۆیەوە گۆرانکـاری تـازە بـۆ رادیکـالیزمی ئیـسلامی لێ دەکەوێتەوە کە لە ناوچەی خێڵەکانـدا سـەریهەڵداوە، کـە زانـای سیاسـی کـوێتی شەملان ئەلعیسا وەکو "خێڵەکایەتیی ئیسلامیی رادیکال" ئاماژەی بـۆ کـردووە. بەقسەی ئەلعیسا، حزبە ئیـسلامییەکان، کـە لـە پـەنجاکان و شەسـتەکاندا وەکـو بزووتنەوەگەلی شاری سەریانهەڵدا تا هاتووە لەگەڵ خێڵەکاندا تێکهـەڵقاون. یـەکێ لە گریمانەکان ئەوەیە کە خولیای خێڵەکی بەرەو لێکدانەوەی رەقەکارانەی ئیسلام لە تەرزی ژیان و بە دیرۆکی خێڵەکاندا رۆچووە. بۆ وەسفکردنی ئەم خاڵـە، چـاودێرێك تێبینی ئەوەی کردووە کە کەسایەتییە سـەرەکییەکانی ئیـسلامی رادیکـال رەگ و ریشەیان لەناو داب و نەریتی خێڵەکی بەر لـە ئیـسلامدا هەیـە[59]. کۆنـەپارێزیی خێڵەکایـەتی- هەڵبـەت رووە کولتوورییەکـەی نـەك سەروسـیما ئایینییەکـەی- و پـەرگیری ئـایینی دەکـرێ یـەکتر پتەوبکـەن. لـە ئاکـامی نـەبوونی هێـزی پارسەنگئامێز- بۆ نموونە حکوومەتێکی ناوەندیی بەهێز، تێکەڵەیـەك لـەم دووانـە دێتەئارا کە بە قسەی نووسەری بەرچاوی کوێتی "بن لادن-ی لێ دەکەوێتەوە"[60].

لەهەمانکاتدا، شایانی گوتنە کە زۆر بزاڤگەلی ئیسلامی پـەرگیر، خێڵـەکی نین. بۆ نموونە، کۆمەڵەی جیهـادی ئیـسلامی میـسری، گروپـە تیرۆریـستەکانی جەزایر: گروپی چەکداری ئیسلامی، گروپی سەلەفی بۆ وەعـزو شـەڕ و کۆمـەڵی ئیسلامی خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا. هەروا لـەو وڵاتانـەی کـە خێڵـەکان لـەناو بنیادی بەهێزی سیاسیدا یەکیان گرتووە وەکو ئەردەن، شێوە هـەرە پـەرگیرەکانی ئیسلامیزم و تیرۆریزم هیچ ریشەیەکیان نییە.

## نەشونماكردنی تۆڕەكانی موسڵمانەتی

تۆڕەكانی ئیسلامی رۆڵێكی گرنگیان لـە رابـوونی ئیـسلامی لـەم سـاڵانەی دواییدا گێراوە. لە چوارچێوەی ئەم پێڤاژۆیەدا، نەشونماكردنی پەرگیریی ئـایینی و تیرۆریزم. ئەم تۆڕانە بەسروشت و بەراشكاوانە ئیسلامین یان كۆبەنـدیی تاكـەكان كە باكگراونـدێكی هاوبەشـی ئایـنییـان هەیـە. تۆڕەكـان، دیاسـپۆرياين (ئـەو كۆمیونیـتە موسـڵمانانەی لە دەرەوەی جیهانی ئیـسلامەتیدا دەژیـن)، مرۆڤانـە، دارایین. چەندین پرس و دۆز ـــئەم تۆڕانـە بەیەكـەوە دەبەسـتێتەوە، لەنێویانـدا نزیكایەتی ئیتینـی، چـین، خێـڵ، رایەڵكـەی بنەماڵـەیی، هـەروا درككـردن بـە نادادپەروەری كە رێگە دەگرێ ئاڵوێری كولتووری رووبدا كە هەندێ جـار كەسـان بەردو رێچكەی زەبروزەنگ دەبات.

ئێـستە وەكو ئێمـە دەزانـین، پـشتگرتنی تۆڕەكـانی موسـڵمانان لـە دیاسـپۆرا، بەتایبەتی لە ئەوروپا، جەمـسەرێكی سەرەكییە لە پارەدان و كردەوەكانی گروپگـەلی سەرەڕۆ و تیرۆریست. ئاسانكاری بۆ چـالاكییەكانی ئـەم گروپانـە دەكـرێ بـە هـۆی بـــەرەنگاریی ئاسایـــشی رۆژئـــاوایی و ئاژانـــسەكانی جێبـــەجێكردنی قـــانوون بـــۆ چاودێریكردنی ئـەو چـالاكیانەی كـە دەدرێنـە پـاڵ گروپـە ئایینییـەكان. وەك ئـەو لێكۆڵینەوانەی دوای 11ی سپتێمبەر كراون، بە ئاشكرا دەریان خست كە دیاسپۆرای موسڵمان لە وڵاتانی وەك ئەڵمانیا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئیسپانیا، بـەلجیكا، سویـسرا تەوەری گرینگی كردەوەكانی قاعیدەو ئەندام پەیداكردن بوون(61).

قاعیدە تاكـە رێكخـراو نییـە كـە موسـڵمانەكانی دیاسـپۆراو تۆڕەكـان بـۆ پـشتەوانی و كردەوەكـانی خـۆی بـەكاریان بێنـێ. رێكخراوگـەلی ئینـسانی و تەندروسـتیی ئیسلامی بوونەتـە بنیـادو بناخـەی سـەرەكی چـەندین گروپگـەلی رادیكـاڵ. حزبـوڵڵا و حـەماس، پـارەوپولی خزمـەتگوزاری كۆمەڵایـەتییان بـۆ پتـەوكردنی بنكـەی سیاسـیی خۆیـان بـەكارهێناوە. حزبـوڵڵا تـۆڕێكی كـارای دامەزراندووە بۆ ئاسـانكاری لەشـاغی و خێرخـوازی لـە سـەرانـسەری خـوارووە رۆژهەڵاتی لبنان و دەستیان بە دیاسپۆرای شیعەی لبنانی رادەگا لە لبنانەوە تـا

رۆژئـاوای ئـەفریقیا و خـوارووی ئـەمریکا. ناوچـەی سـەر سـنووری بـەرازیل- پاراگوای- ئەرجەنتین کە لایەن وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریکا بـە خـاڵی مـەکۆی پەرگیری ئیسلامی لە ئەمریکای لاتین دادەنرێ و بە هەرێشەی نیودگۆی جیهان بۆ سەر ئاسایشی ئەمریکا[62].

ئەو خزمەتگوزارییە تەندروستییانەی "مؤسسة الحرمين" لـە چیـچان، بالکـان، صۆمال، ئەندەنووسـیا و لە شوێنی دیکەی پڕ کێشەو پێکـدادان پێـشکەشیان دەکـا بەستراونەتەوە بە رێکخراوگەلی سیاسـیی رادیکـالی ئـەم وڵاتانـە. یـاخیبووان ئـەم کۆمەکە مرۆییانە بۆ چارەسەرکردنی پزیشکییانەی کادیرەکانی خۆیان و کاریگـەریی دانان لەناو دانیشتوانی ناوچە بێبـەش و هـەژار و فەرامۆشـکراوەکاندا بـەکاردێنن. رێکخراوگەلی ئەورووپی و باکووری ئەمریکا پـارەو پـول بـۆ ئـەم چـالاکییانە پەیـدا دەکەن. گەریلاکانی چیچان، بزووتنەوەی ئیسلامی لـە ئۆزبەکـستان، ئۆپۆزیـسیۆنی یەکگرتووی تاجیك، حزبولتەحریر چوونەتە ناو ئەم سیستەمە بۆ کۆمـەك خواسـتن و پشتگیری پەیداکردن لە قەوقاز و ئاسیای ناوەڕاسـتدا.

تۆڕەکانی ئابووری، کۆمپانیای رووکەشیان دروستکردووە کە پـارەو پـول بـۆ چالاکییەکانی گروپگەلی سەرەڕۆ و تیرۆریست دابین دەکـەن[63]. میتـۆدی ئـەوان بریتییە لە بەکارهێنانی ناوچەی بازرگـانیی ئـازاد بـۆ گواسـتنەوەی کەلوپـەل و خزمەتگوزاری پشتەوانی، سیستەمی غەیرە رەسمی حەواڵە بـۆ گواسـتنەوەی بـێ شوێنەواری پارەو دراو، میتۆدەکانی تری پارەی نەخت گواستنەوەو تەحویلکردن، لەوانە زێڕو ئەلماس. لێکۆڵینەوە لە شانە نووستووەکانی قاعیدە لـە ئـەورووپا لـە دوای هێرشەکانی 11ی سپتێمبەر، ئەوەی دەرخست کـە بەشـێوەیەکی بـەرفراوان بزنسی رەواو وەگەڕخستن و کارپێکردن لە لایەن سەرکارەکانی قاعیدەوە کراون بۆ داهات پەیداکردن بۆ پشتەوانیکردنی خۆیـان و چـالاکییەکانیان. قاعیـدە خـۆی وەبەرهێنانی بەرفرەی دارایی لە سوودان، لە سەرانسەری جیهاندا هەیە، ئەمە بێ لە کاری بچووك بچووك لە جێگەی گرینگ لە هەر چوار کەناری دنیادا.

دامەزراوەی تاوانکاری-یش خزمەت بە چالاکیی توندوتیژانەی ئیسلامی دەکەن. قاعیدەو حزبوڵڵا بە ملیۆنان دۆلاریان لە فرۆتنی کەرەستەی سڕکەر دەستدەکەوێ. حزبوڵڵا قازانجێکی زۆر لە دەشت و دۆڵی بیقاع دەکات بۆ بەرهەمهێنانی "مادده بیهۆشکەرەکان" و ترافیك لە باکووری ئەمریکا بۆ (تمویل)ی چالاکییەکانیان لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناویندا. حزبوڵڵا و قاعیدە بەپێی هەندێ راپۆرت، سەرمایەگوزاری لە بازاری رەش دەکەن بۆ ئەڵماس و زێری ئەفریقی. پەرگیرە موسڵمانەکان بەشێوەیەکی رۆتینی پەنا بۆ کاری قاچاخچێتی، خەڵك رفاندن، حیلەو حەواڵە بۆ پارەپەیداکردن و جێبەجێکردنی ئامانجە سیاسییەکانیان دەبەن. لە خوارووی ئەمریکا، سەرکارەکانی حزبوڵڵا خزاونەتە ناو چالاکیی بەرفرەی تاوانکاری، دادۆشینی کۆمیونیتەی خۆجێی عەرەب و فرۆفێڵی هێنان و بردنی خەیاڵی[64].

**پەیدابوونی ماس میدیای نوێ:**

رادیکالیزمی ئیسلامی بەتاوبووەو تورەیی پەرەپێ دەدا بەهۆی هاتنەئارای میدیای سەتەلایتی ناوچەیی کە نابەرپرسیارانەو جەریئانەو بە باشی خۆی نیشانداوە، تۆڕی جەزیرەیە کە بنکەکەی لە قەتەرەو خەتی سیاسی ئیخوانولموسلمین رەنگ پێ دەداتەوە. ئەم میدیا نوێیە، نموونەی بڵاوکردنەوەی هەواڵە لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا کە قۆرخی زانیاری شکاندووە کە لایەن میدیای کۆنترۆڵکراوی دەوڵەتەوە پاوان کرابوو. (جاران، راپۆرتەکانی هەواڵ لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بریتی بوون لە وێنەی ڤیدیۆیی کاربەدەستان کە تۆقەیان لەگەڵ میوانان دەکرد) لە ساڵی 1990دا، بۆ نموونە، میدیای سعودی بە گوێگران و بینەرانی خۆی نەگوت کە عیراق پەلاماری کوێتی داوە تا چەند رۆژێك دوای ئەم هێرشە، کاتێکیان بە حکوومەت دا تا خەتی رەسمی دابینێ) ئەمە بەو مانایە نییە کە بڵێین میدیای نوێ شتێکی زۆری بۆ بڵاوبوونەوەی کولتووری لێ بوردەیی کردووە. ئەم میدیایانە چیرۆکی ئەنتی ئەمریکایی بڵاودەکەنەوە، ئەنتی

رۆژئاوایی، ناوەڕۆك ئەنتی سامی (لێرە مەبەست جولەکەیە). پرۆپاگندەکانی قاعیدە پەخش دەکەنەوە و هەندێ جار پەلاماری شانشینەکانی سعودی و ئەردەن دەدەن (وێرای زمانی زبری ئۆپۆزیسۆنگەریی، قسە لەسەر سیاسەتەکانی قەتەری ناکەن). میدیا ئیستیغلالی ئەو توڕەیی و ستەمە راستەقینەو وەهمییە گەلێرییەی کە هەیە دەکاو قەبەی دەکاتەوە.

بەدرێژایی کات، ئەم کراوەیەی میدیای ناوچەیی لە دوو رێگاوە کاری خۆی دەکا: لە باشترین حاڵەتدا، بەشداری پرۆسەی دیموکراتیزەکردن دەکات لە رێگەی رەخساندنی سەرچاوەیەکی بەدیل بۆ زانیاری لە بەرانبەر میدیای کۆنترۆڵکراوی دەوڵەتدا. پەرەسەندنی ئەم میدیایە، شیان و توانی ئەوەی هەیە کە تواناو بڕست بە ئیختیاری زاتی گەورەتر ببەخشێ بۆ وتووێژی ناودکی، نیشاندان و دەرخستنی ئایدیای نوێ[65]. لێ مخابن، بەڵگەو دەلیلی کەم هەن کە ئەم کاریگەرییە پۆزەتیڤانەیان هەبێ: لەبری، ئەم میدیا تازەیە، ستیریۆ تایپ و ریوایەتی بە قوربانیبوونی عەرەبی بەهێز دەکا کە لە ئەجێندای رادیکالەکاندا دەور دەگێڕن.

### رووداوی کارەساتبار

لەودیوی ئەم فاکتەرانەوە، مۆدالیتیتی تایبەت کە ئیسلامی سیاسیی رادیکال وەریانگرتووە ئاکامی ژمارەیەك رووداوی کارەساتبار یان یەکلاکەرەوەیە کە ژینگەی سیاسییان لە جیهانی موسڵمانەتیدا بەشێوەیەکی سەرەکی گۆڕیوە. ئێمە لە خوارەوە لەو رووداوە کارەساتهێنانە دەدوێین:

### شۆرشی ئیسلامی ئێران:

شۆرشی ئێرانی نیشانی دا کە فەندەمێنتالیستە ئایینییەکان دەتوانن بە ئاشکرا رژێمێکی بەهێزی عەلمانی بروخێنن- لەوەش گرینگتر کاتێ ئەو رژێمە لە لایەن ئەمریکاشەوە پشتی گیرابێ- لە جێگەیدا دەوڵەتێك دابمەزرێنن کە پێناسەیەکی تەواو ئیسلامی هەبێ. لە رۆژهەڵاتی ناوینی عەرەبدا، کاریگەریی شۆرشی ئێرانی خۆی لە بە ئیسلامیکردنی شەڕو پێکدادانی فەلەستینی و

لبنانییەکان نواندووە. پێش 1979، ئیسلامی سیاسیی رایکال بەشێوەیەکی سەرەکی لەم کێشەو شەڕانەدا جێگەیەکی بۆ خۆی نەکردبۆوە. پاشان سوپای پاسداران بوونی سەربازی خۆی لە لبنان دامەزراند، کە کۆمیونیتەیەکی گەورەی شیعە بنکەیەکی کۆمەلایەتییان بۆ سەرهەلدانی حزبوللا رەخساند وەکو دەستنێژی سیاسەتی ئێرانی. مەلاکانی ئێران هەروا پێوەندی و رایەلکەی خۆیان لەگەل گروپە فەندەمێنتالیستە خۆجێیەکان دامەزراند لە دەولەتانی کەنداوی فارس. باکووری ئەفریقیا، خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا.

**شەڕی ئەفغانی:**

لەسەرانسەری جیهانی موسلمانەتیدا، میلیتانت بۆ شەڕی سۆڤیەتییەکان لە ئەفغانستان چوون. لەکاتێکدا شەڕڤانە ئەفغانییەکان، بەگشتی خۆیان بە موسلمان دەزانن، ئەوان بەشێوەیەکی سەرەکی خەباتی خۆیان بەشەڕی رزگاری نیشتمانی ناو دەبەن. لەسەرەتادا رادیکالە ئوسولییەکان لەناو بزووتنەوەی موجاهیدینی ئەفغانیدا بالادەست نەبوون. بەهەرحال کۆمەکی زۆرو زەوندی سعودی بەشێوەیەکی نا یەکسان، لە کەنالی رێکخراوی ئیستخباراتی پاکستانییەوە بە گروپە فەندەمێنتالیستە رادیکالەکانی وەك حزبی ئیسلامی گەلبەدین حیکمەتیار دەکرا. تەجنیدکردن لە حوجرەو مەدرەسان لە پاکستان دەستی پێکرد و دواتر دەرچووانی ئەو مەدرەسانە بوونە بڕبڕەی پشتی تالیبان و رێکخراوی تیرۆریستی کشمیری.

لەکن موجاهیدە بیانییەکان، شەڕی ئەفغانی سادەو رەوان جیهادێکی بێگەرد بوو، لۆجیکانە لە شەڕگەکانی تری وەك کشمیر، چیچان، مانداناو، بۆسنیا بەڕێوەدەچوو. ئوسامە بن لادن لەگەل وتاربێژی رادیکالی فەلەستینی عەبدوللا عەززام بەیەکەوە، (مكتب الخدمات)یان دامەزراند، لەو رێگەیەوە خۆبەخشە موجاهیدە بیانییەکانیان تەجنیدو کۆنترۆلکرد. عەززام، ئەمیر یان رابەری رێکخراوەکە، دوای جیابوونەوەی لە بن لادن، بە خۆی و دوو کوڕی بە هۆی

تەقینــەوەی بۆمبێــك لــە نۆڤامبــەری ســاڵی 1989دا كــوژرا. بەشــێوەیەكی ناراستەوخۆ، عەزام ویستویە جیهاد لە ئەفغانستان ببا بۆ یارمەتیدانی موسـڵمانە چەوساوەكان لەسەرانسەری دنیادا، بەتایبەتی، كشمیر و چیچان و بۆسنیا كەچـی بن لادن ویستویە تیشكۆی هێـرش بخاتـە سـەر ئـەمریكاو لەبـەینبردنی رژێمـە عەرەبییەكانی سەر بەرۆژئاوا[66].

لیستی ئەو "ئەفغانییانـە"ی شـارەزای نـاو شـەڕی ئـەفغانی، كـە رۆڵێكـی سەرەكییان لە بزووتنەوەی ئیسلامیی رادیكاڵانەی چەكداری و كاری تیرۆریستیدا گێڕا لە سەرانسەری جیهاندا، لیستێكی فراوانـە. زۆر لـەو عەرەبـە ئەفغانییانـە رۆڵێكی بنـچینەییان گێـرا لـە یاخیگـەری ئیـسلامیی جـەزایری، لـە شـالاوی تیرۆریستی ئیسلامی لە میسر لە سەرەتای نۆهەتەكاندا، لـە بۆسـنیا، چیـچان، كشمیرو خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیا. شەڕی ئەفغانی نەك هەر تەنیا وەك زەوینەی راهێنان وابوو بۆ رادیكاڵ و تیرۆریستە ئیسلامییەكانی ئەمڕۆ بەڵكە پێڤاژۆیـەك بـوو بـۆ خولقـانی تـۆڕی بـان نەتـەوەیی كـە خزمـەتی كـرد وەك كـەناڵێك بـۆ ئۆپەراسیۆنەكانی قاعیدە.

### شەڕی یەكەمی كەنداو:

شەڕی كەنداو ئەو درزەی لەنێوان سعودییەكان و هاوپەیمانەكانیدا هـەبوو لـە جیهانی موسڵمانەتیدا فرەتركرد، بە عولەماكانیشەوە كە لەلایەكەوە زۆر ژیرو بێ وچان قسەی خۆیان دەكەن و لە سەرێكی تریـشەوە لـە هـەمووان پـتر توێـژێكی ئیسلامی سەرەڕۆن. لە گۆشەنیگای رادیكاڵەكانـەوە، سـعودیە سازشـی لەسـەر شــەرعیەتی ئــایینی خــۆی كــردووە بــە رێگــەدان بــەكافران كــە بێنــە نــاو پاشانشینییەكەیەوە. راوەستانی سعودیە لەتەك رۆژئاوادا لەشەڕ دژی دەوڵەتێكی موسڵمان (با دەوڵەتێكی عەلمانی وەكو رژێمی عیراق و تۆمارە سـەركوتكەرەكەی هیچ پێوەندیشی بە ئیسلامەتییەوە نـەبێ) پرۆژەیـەكی ئیـسلامی ئەلتـەرناتیڤی دژی بنەماڵـەی پاشـایەتیی سـعودی هێنایـە ئـارا (Kepel, 2002). تـازە-

وەهابییەکان، هەروەکو بەرهەڵستکاری سعودی و شرۆڤەوانی سیاسی عەلی ئەلئەحمەد ئاماژەیان بۆ دەکا[67]، چوونە پاڵ ئیخوانولموسلمین و عەرەبە کۆچبەرەکان و ئایدیۆلۆجیای ئەوانیان پەسندکرد. ئەوان دەستیان کرد بە قسە دژی بوونی هێزی ئەمریکایی لەسەر خاکی سعودییە و دژی بروا و متمانە بوون بە دامەزراوەی ئایینی کلاسیکی چونکە ئەوانە دەیانگوت بوونی ئەو هێزانە بۆ رزگارکردنی کوێت لەسەر خاکی سعودیە رێگەی پێ دراوە رەوایە. یەکێ لەو تەوژمانەی تازە-وەهابی، لە فەتوای پێشووی پیاوە ئایینییەکانی وەهابی کۆڵییەوە سەبارەت بەو هەلومەرجانەی رێگەدەدەن بە یاخیبوون و هەڵگەرانەوە لە حوکمڕانێکی موسڵمان و گەیشتە ئەو ئەنجامە کە حکوومەتی سعودیە حکوومەتیکی کافرە و پیاوە ئایینییەکانی دامەزراوەی رەسمی حکوومەت، لە دین وەرگەڕاون.

## رووداوی کارەساتباری ناوچەیی تایبەت:

هەندێ رووداو بۆ هەندێ ناوچە لە جیهانی موسڵمانەتی کارەساتبارو بۆ هەندێك ناوچەی تریش نا. بۆ نموونە، لە جیهانی عەرەبدا، شەڕی 6 رۆژەی 1967، تا رادەیەکی زۆر حکوومەتە عەلمانییەکانی لەبەرچاوان خست و دەنگی بزووتنەوە ئیسلامییەکانی نێرکرد کە هاوشانی کێشەی بەردەوامی نێوان ئیسرائیلی و فەلەستینییان، ئەمڕۆ ئەمریکایان تەنگاو کردووە. لە خوارووی ئاسیا، کە ماڵ و لانەی 3/1ی موسڵمانانی دنیایە، ئەو ریزبەندییە بەکۆمەڵەی لەسایەی حوکمڕانیی بەریتانیدا روویداوە و پارچە-پارچە بوونی بەرودوای ئەو کیشوەرە، بوونە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئیسلامیی رادیکاڵ، لەکاتێکدا چرکەساتە کارەساتهێنەکانی تر، وەك لەبەریەکهەڵوەشانەوەی پاکستان لە ساڵی 1971، تێکدانی مزگەوتی ئایوزا، ساڵی 1992 لە لایەن نەتەوەپەرستە هندۆکەکانەوە، بەنزینیان بەسەر سیاسەتگەلی توندڕۆی بنەما ئایینی داکرد. لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیا، قەیرانی ئابووری لە کۆتایی نۆهەتەکاندا،

هەرەسهێنانی رژێمی سۆهارتۆ لە ئەندەنووسیا، لا تەریکی کەمینەی موسڵمان لە فیلیپین و تایلاند، هۆکارە بزوێنە سیاسییەکان لە مالیزیا هەندێك کەسیان خستۆتە سەر ئەو بارە کە سیاسەتگەلی ئایینی وەك دەستاویژێکی دەسەلات ببینن. لە ئاسیای ناوەڕاستدا، دوای ماوەیەکی درێژی بێ دەنگی لەسایەی سۆڤیەتدا، بزووتنەوە ئایینییەکان لە هەندێ کۆماری ئاسیای ناوەڕاستدا زۆر بە کەف و کوڵ بوون لە کاتێکدا ئەو دەوڵەتانە تێدەکۆشان بۆ دیاریکردنی پێناسەی خۆیان لە دوای سەردەمی سۆڤیەتدا و بۆ دیاریکردنی پێوەندی خۆیان بە رووسیاو هەندێکی تریشیان بەدوای نفووز پەیداکردن لە ناوچەکەدا دەگەڕان[68].

## کاریگەرییەکانی کێشەی فەلەستین و کشمیر:

کێشەی ئیسرائیل- فەلەستینییان رووداوێکی کاردساتهێن نییە بەڵکە هەلومەرجێکی بەقووڵداچووە کە رەنگرێژی خیتابی سیاسی بۆ ماوەی نیو سەدە زێتر لە رۆژهەڵاتی ناویندا کردووە. گریمان، بۆتە کۆسپ لەبەردەم پێگەیشتنی سیاسیی لە جیهانی عەرەب لە رێگەی بەگەڕنەخستنی سەرچاوە دەگمەنە ماددی، سیاسی و دەروونییەکان بۆ لەباریەکنان و چارەکردنی گرفت و ئاریشەکانی ناوخۆ. تێکشکانە یەك دوای یەکەکانی عارەبان لە شەڕ لەگەڵ ئیسرائیلییاندا، هەندەی تر رژێمەکانی عەرەبیان لەبەرچاوان خست و لە سەرهەڵدانی بزووتنەوە ئیسلامییە ئوسوڵییەکاندا.

دیارە جێی پرسیار نییە کە کێشەی فەلەستینی- ئیسرائیلی بۆ زۆر لە موسڵمانان پرسێکی دەمارئاسایە. بەهەرحاڵ مانای ناوەڕۆکی پرسی فەلەستینی سەبارەت سیاسەت پشت بەو مەوداو ئاقارە دەبەستێ کە تا چەند توڕەیی و نارەزایی ئەنتی رۆژئاوایی بەرفەرمانی هۆکارگەلی دەرەکییە، نەمازە سیاسەتی ئەمریکی لە هەمبەر کێشەی فەلەستینی-ئیسرائیلیدا. ئەگەر ئەمە وابێ، چارەسەرکردن یان کەمکردنەوەی ئەو کێشەیە زۆر لەو توڕەییە کەم دەکاتەوە کە لەبەرانبەر ئەمریکادا دەنوێندرێ. هەڵبەت ئەمەش ئەو پرسیارە دێنێتە گۆڕێ کە

دەبێ ئەو کێشەیە چۆن چارەسەر بکرێ، یان ئەوەتا لە هەلومەرجی ئەمڕۆدا هەرگیز ناتوانرێ چارەسەر بکرێ، چونکە شتێکی کەم هەیە کە ئیرادەی سیاسی هەبێ بۆ ئەو لایەنانە کە زەوینەی هاوبەش ببیننەوە. (مەرجی سەرەکی پێشوەختە ئەوەیە کە دوو لایەنەکە توانایان هەبێ بڕگەکانی ڕێککەوتننامە جێبەجێ بکەن. لەبەرئەوەی ئێستا دەسەڵاتی فەلەستینی تەنیا هێز نییە لە سەرجەم ناوچەکانی فەلەستیندا، ئەم مەرجە لە تەرەفی فەلەستینی بوونی نییە). بەهەرحاڵ، وەکو یەزید سائیغ ئاماژەی بۆ کردووە، هەنووکە ڕێچکەی توندوتیژو تێکدەرانەی پێوەندی فەلەستینی- ئیسرائیلی تا رادەیەکی مەزن، ئەرکی دەسکردنەوەی بە پرۆسەی ئاشتی لە ئایندەی بەرچاودا، بە زەحمەت ئێخستووە[69].

لەگەڵ ئەوەشدا، چ نییە کە چەند دیمەنەکە ترسناکە، ئەگەر گرفتەکە بنەمای سیاسی هەبێ، بەلایەنی کەمەوە هەندێ ئومێد هەن کە لە هەندێ قۆناخی ئایندەدا ئاشتبوونەوە بکرێ. ئەگەر، لە سەرێکی ترەوە، سەرچاوەکانی توڕەیی و نارەزایی عارەبان بەرفەرمانی سیاسەت نەبن، پاشان تەنانەت چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستینی — ئیسرائیلیش سەقامگیرییەکی درێژخایەنی لە جیهانی عەرەبیدا لێ ناکەوێتەوە. دەگوترێ، گرفت و ئاریشەی فەلەستینی وەکو "کۆڵەکەی ڕووناهی" سەیر بکرێ بۆ توڕەیی کە لەوانەیە لە هۆی ترەوە کەوتبێتەوە، چارەسەرکردن یان سووککردنی ئەو گرفتە، گرژی و ناخۆشی بۆ ماوەیەکی کورت کەم دەکاتەوە، بە نەهێشتنی یەکێ لە سەرچاوە سەرەکییەکانی ئەو توڕەییە.

تا ئەو رادەیەی کە پرسی فەلەستینی خزمەتی کردووە وەك میکانیزمێك لە هەندێ وڵاتی عەرەبیدا بۆ لادانی سەرنج لەسەر هەلومەرجی ناوەخۆ بۆ دەرەوە، دەکرێ بڵێین کشمیر شتێکی لەو بابەتەی بۆ پاکستان کردووە، پرسی کشمیر وێرای ئیسلام، هۆکارێکی ناوەندیی یەکخستنە بۆ پاکستان، حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی پاکستان شەڕێکی بە وەکالەتیان لەوێ کردووە،کە تا رادەیەکی زۆر سەرجەم مەبەستەکانی تری دەوڵەتی پاکستانیان خستۆتە بەر فەرمانی ئەم کێشەیە. ئەم دینامیکە بە شێوەیەکی دراماتیکی پەیکەری سیاسەتگەلی

ناوخۆی پاکستانیان گۆڕیوە لە ڕێگەی بەهێزکردنی بزووتنەوە سەردڕۆیەکان و دەسکەلاکانیان لە هێزەکانی ئاسایشی پاکستانیدا.

## کاریگەریی 11ی سپتێمبەر و شەڕی دژ بە تیرۆریزم

پەلامارە تیرۆریستییەکانی 11ی سپتێمبەر، کاردساتێکی خویا بوون بەپێی تێگەیشتنی ئەمریکا بۆ تەناهی خۆی و پێوەندییەکانی لەگەڵ جیهانی موسڵمانەتیدا. هەروا ئەو پەلامارانە تێگەیشتنیان لە هەڕەشە لەناو ئەمریکادا گۆڕی. پرسگەلێك کە پێش 11ی سپتێمبەر لە ئەمریکا قەبە دەکرانەوە لە پێوەندی دوولایەنەی ئەمریکا بە وڵاتگەلێك لە بازنەی ئیسلامی لە مەغریبەوە بگرە تا مینداناو گرنگیان کەم بووەوە، هاریکاری لەشەڕی دژ بە تیرۆریزم لە (بەرژەوەندی و کاروباری ئەمریکا) خویا بووە.

لێ ئایا 11ی سپتێمبەر گۆڕانکارییەکی شایان باسی لە هەڵویستی موسڵمانان لێ کەوتەوە؟ دیدی هاوبەش لەنێو وتوویژکارانی ئێمەدا ئەوەیە، کە 11ی سپتێمبەر سەردەمێکی نوێی بەدوای خۆیدا هێنا لە ئەمریکاو ئەوروپادا، بەلام لە جیهانی موسڵمانەتیدا نا. وەك وتووێژکارێکی میسری پێی گوتین، 11ی سپتێمبەر پێشهاتێکی ئەمریکایی بوو، ئاکامەکانی ئەمریکا بەسەر موسڵمانان داشکایەوە. زۆربەی موسڵمانان بەو مردن و کاولکارییەی 11ی سپتێمبەر هەراسان و پەشۆکان- لێ زۆر کەس بەتایبەتی لە جیهانی عەرەبیدا- دڵیان ئاوی خواردەوە کە لوتی ئەمریکا لە خوێن وەردراو ئەمریکا ئەو ئێش و ئازارو ژانەی چەشت کە بڕوایان وابوو دەرهەق بە موسڵمانان دەیکرد[70]. هەرچەند ریسواو تاوانبارکردنی پەلامارەکە کرا، لێ بەمەرج و کۆت بوو. کاردانەوەی گشتیی عەرەبی لەبەرانبەر هێرش و پەلامارەکاندا، هەندێ تێکەڵەی لەمانەی خوارەوەی تێدابوو:

- هەق لێکرانەوە (تۆڵەلێکرانەوە): ئەمریکا تامی ئەو تالاوەی چەشت کە چەندین ساڵە بەگەرووی جیهانی عەرەبی (وڵاتە هەژارو نەدارەکانی دنیا)ی دادەکا.

- ریسواکردنی ئەو پەلامارانەو لە قەڵەمدانی بە کاری تاوانکارانەو نا ئیسلامییانە، لێ ئاکامێکی سروشتی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاش بووە، کە دەبێ بەشێوەیەکی سەرەکی لۆمەو ئۆباڵی ئەو ئاکامە بخاتە ئەستۆی خۆی.
- بڵاوکردنەوەی تیوریگەلی پیلانگێری کە جەختیان لەوە دەکردەوە کە ئەوە کاری سەرەڕۆیە ناوخۆییەکانی ئەمریکا، حکوومەتی ئەمریکا، دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل (مۆساد)یە.
- رەتکردنەوەی ئەو پروپاگندەو ئیدعایانەی کە گوایا پەلاماردەران عەرەب یان موسڵمان بووبن، بەو پاساوەی کە مرۆی موسڵمان کاری کۆمەڵکوژی یان کاری تیرۆریستی ناکاو ئەو پەلامارە هەندە ئاڵۆزە بەتەنیا بەوان جێبەجێ ناکرێ.

لەگەڵ ئەوەی کە پێشهاتی 11ی سپتێمبەر وەك رووداوێکی کارەساتهێن لە جیهانی موسڵمانەتی چاوی لێ نەکرا، بەڵام ئەو شەڕەی دوای 11ی سپتێمبەر دژی تیرۆریزم بەرپاکرا، وا چاوی لێکرا. دوای 11ی سپتێمبەر، بەتایبەتی ئۆپەراسیۆنی جێگیرکردنی ئازادی و ئۆپەراسیۆنە بەرفراوانە جیهانییەکانی ئەمریکا دژی تیرۆریزم، کە ستراتیجی دووبارە پشتگرتنی هێنایە گۆڕێ، کە ژمارەیەك وڵات لە جیهانی موسڵمانەتی لەتەك ئەمریکادا وەستان لە شەڕی جیهانیی دژ بە تیرۆریزم، یان دەست و برد هاریکاری دژە- تیرۆریستیان فراوانکرد. گۆڕانی هەرە دراماتیك لە پاکستان روویدا، کاتێ سەرۆك پەرویز موشەرەف خۆی وەك پشتەوانێك دژی سەرەڕۆیە ئیسلامییەکان نیشانداو، دەزگای ئیستخباراتی ناوەخۆش کەوتە دژایەتی کردنی سەرەڕۆیان. ئەمریکا پێوەندی سەربازیی نزیکی لەگەڵ ئۆزبەکستان و دەوڵەتانی دی ئاسیای ناوەراستدا دامەزراند کە پەرەسەندنێکی بیرلێ نەکراوە بوو پێش 11ی سپتێمبەر. لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیادا، کە هەندێ وەك "بەرەی دووەمی شەڕ دژی تیرۆریزم" ئاماژەی بۆ دەکەن، ئەمریکا هەندێ کۆت و بەندی لەسەر یارمەتی سەربازی بۆ ئەندەنووسیا هەڵگرت و لەگەڵ فیلیپین تێهەڵچۆوەو، کۆمەکی سەربازی تا رادەیەك زۆری کردو هێزەکانی ئەمریکای بەکارهێنا بۆ مەشق پێکردنی هێزەکانی فلیپین لەسەر ئۆپەراسیۆنی دژە تیرۆریستی.

شەڕی جیهانی دژە تیرۆریزم کاریگەری لەسەر سیاسەتگەلی ناوخۆی ژمارەیەك وڵات هەبووە لە جیهانی موسڵمانەتی. دابەشبەندی نێوان موسڵمانە میانڕۆ و رادیکاڵەکانی قوڵتر کردەوە و مەترسیی تازەی سیاسی و پەرەسەندنی هەم بۆ حکوومەت و هەم بۆ کاراکتەرە سیاسییەکان بەرهەمهێناوە. هەندێ حکوومەت، هەروەکو لەسەرەوە دیاردی بۆ کرا، شەڕی جیهانی دژ بە تیرۆریزمیان وا دی: وەك دەرفەتێك بۆ تەفروتوناکردنی ئۆپۆزیسۆنی ئیسلامی. لە مالیزیا، حکوومەت ئەوەی هێنایە گۆڕێ کە رایەڵکەو پێوەندی لەنێوان هەندێ ئەندامی گروپگەلی نهێنی تیرۆریست لە 2001 و حزبێکی سەرەکی ئۆپۆزیسیۆنی ئیسلامی، واتە حزبی ئیسلامی پان مالای دا هەیە[71]. مەترسییەك کە هەندێ سیاسەتوان و لایەنگرانی مافی مرۆڤ قامکیان بۆ راکێشا، ئەوەیە هەندێ لە حکوومەتان بۆ سڕینەوەی هێڵی نێوان گروپ و کۆڕی توندوتیژ و ناتوندوتیژ، بۆ سەندنەوەی شەرعیەت لە کۆڕو کۆمەڵەی ئاشتیخوازی ئۆپۆزیسیۆن و پاساودانەوەی پێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤ، لە هەوڵدان[72].

هەروا شەری جیهانی دژە تیرۆریزم هەندێ توێژی موسڵمانانیشی رادیکاڵیزە کرد، یان میلیشیای ئیسلامی چالاکترکرد. لە سعودیەی عەرەبی، ژمارەیەك عولەمای ئایینی ناڕازی بوون لە پشتەوانی سعودیە بۆ کردەوەی سەربازی ئەمریکا لە ئەفغانستان. شێخ حەمود ئەلشوعەیبی و شێخ عەبدوڵلا بن جبران فەتوایان دا کە نەك هەر پاساویان بۆ پەلاماردانی سەنتەری بازرگانیی جیهانی هێنایەوە، بەڵکە ئەو موسڵمانانەی کە هاریکاری ئەمریکایان کردووە وەك لە ئایین وەرگەڕاو شەرمەزارکرد، ئەمەش بنەماڵەی پاشایەتی سعودیەی دەگرتەوە (Algar, 2002). لە ئەندەنووسیا رێکخراوە ئیسلامییە سەرەکییەکان پەلامارەکەی 11ی سپتێمبەریان شەرمەزارکرد، لێ دژی ئۆپەراسیۆنی ئەمریکا بوون لە ئەفغانستان. رکابەرە موسڵمانەکانی سەرۆکە عەلمانییەکەی ئەندەنووسیا مێگاواتی سۆکارنۆپۆرتی هەوڵیاندا ئەوە بۆ خۆیان بقۆزنەوە کە پشتەوانییە بەئاشکراکەی ئەو لە ئەمریکا و لە شەڕی جیهانی دژە تیرۆریزم ئۆباڵی ئەوەی بخەنە ئەستۆ کە ئەوە شەڕە دژی ئیسلام.

پرسی سەرەکی کە لە تاقیکردنەوەی شەڕی جیهانی دژە تیرۆریزم وەدەست هاتووە ئەوەیە کە چۆن دەکرێ لەنێوان ئامانجەکانی تەفروتوناکردنی تیرۆریزمی ئیسلامی و بەهێزکردنی حکوومەتگەلی دۆست و هێزە میانڕۆیەکان لە جیهانی موسڵمانەتیدا، گونجاندن بکرێ. موسڵمانە میانڕۆیەکان هاوپەیمانی هەرە بەکاری ئەمریکاو بەهایەکانی ئەمریکا و دیموکراسی و پلورالیزمن دژی هەڕەشەکانی ئیسلامی رادیکاڵ. ئیدی، پرسیار ئەوەیە، چۆن ئەمریکا شەراکەتێك دروست بکا لەگەڵ موسڵمانە میانڕەوەکاندا بۆ بەرەوپێشبردنی بەهاگەلی دیموکراتی و پلورالیستی و کەمکردنەوەی حەساسیەتی حکوومەتگەلی میانڕەو.

## نێوەڕۆك و ماناكانی شەڕ لە عێراقدا

شەڕ لە عیراق، لەگەڵ داگیرکردنی ئەو وڵاتە لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە تا دامەزراندنی حکوومەتێکی عیراقی رووداوێکی هەرەگرنگ بوو لە پێوەندی ئەمریکا بە وڵاتانی رۆژهەڵاتی گەورەی ناوەراست لە نیو سەدەدا. بۆ یەکەمین جار دوای کشانەوەی هێزە کۆلۆنیالییەکانی ئەورووپا لە رۆژهەڵاتی ناوەراست، وڵاتێکی رۆژئاوایی بەرپرسیارەتی حوکمرانی لە وڵاتێکی موسڵماننشین زەوت بکا. لێرە مەحەکەکان، زۆر بەرزن.

**کاریگەریی شەڕ لە عیراق دەکرێ بۆ سێ ئاست هەڵبسەنگێندرێ:**

1- کاریگەرییەکانی بۆ سەر پەرەسەندنی ئایندەی عیراق.
2- کاریگەرییەکانی بۆ سەر رۆژهەڵاتی ناوەراستی گەورە.
3- کاریگەرییەکانی بۆ سەر جیهانی موسڵمانەتی.

### ئایندەی عێراق:

لەنێو عێراقدا، سەرهەڵدانی "مقاومە"یەکی بەربڵاوی چەکداری دژی هێزەکانی هاوپەیمانان و حکوومەتی کاتیی عێراق و وەڵامی هاوپەیمانان، کوژراو و برینداری زۆری مەدەنی و کاولکاری ژێرخانی ئابووری، دواکەوتنی ئاوەدانکردنەوەو پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکانی، لێکەوتەوە. ئەم

ئەنجامانە ئەنتی ئەمریکاییان لێکەوتەوەو بوونە هۆی ئەوەی وەدیهاتنی مەبەست و ئامانجە درێژخایەنەکانی ئەمریکا سەختترو پڕ کێشەتر بن.

بەهەرحاڵ، ئەگەر ئێمە بمانەوێ شوێن پێی سەمت و رەنگ و رووی ئایدیۆلۆجی هەڵبگرین لەم راپۆرتەدا، دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو زەبروزەنگە بەربڵاوە چەندین فاکتەری سەرەکی لەپشتەوەیە:

فاکتەرێکیان ئەوەیە کە زۆرینەی دانیشتوان، لەباری سیاسییەوە میانڕۆن. بەپێی راپرسییەك کە لە چوار پارێزگادا لە 23ی ئابی 2003دا کراوە، تەنیا 33٪ی وەڵامدەرەوەکان، حکوومەتێکی ئیسلامییان گەرەك بووە، 60٪ەکەی تریان دژ بوون. شیعەکان دژی دامەزرانی حکوومەتێکی ئیسلامین بە رێژەی 66 لە بەرانبەر 27دا. شیمانەی ژیانەوەی بەعس، خەڵکی کەمتر لەکەڵدایە. 74٪ لە وەڵامدەرەوان بڕوایان وایە سەرکردەکانی بەعس کە تاوانیان لە رابردوودا کردووە، دەبێ سزا بدرێن[73]. هەڵوێستی میانڕۆیانە لەناو زۆرینەی شیعەدا، خۆی لەو پشتەوانییە کەمەی یاخیبوونی موقتەدا سەدردا دەبینێتەوە. سەرکردە ئایینییە شیعە هەرە بەدەسەڵاتەکان، پشتەوانی خۆیان بۆ پرۆسەی گواستنەوەی سیاسی بە هەماهەنگی ئەمریکاو یوئێن، دەربڕیوە. ئاخوندی هەرە باڵای ئایینی، ئایەتوڵڵا سیستانی، تیرۆریزم-ی ریسواکرد، تەبای سەرکردە ئایینییە سوننەکان.

کەواتە، ئاریشەکە، پشتەوانی گەلێری سەرەڕۆیان نییە، بەڵکە توخم و دەست و پێوەندە رادیکاڵەکان دەیانەوێ ئەو بۆشاییەی دەسەڵات پڕ بکەنەوە کە بەهۆی کز و لاوازیی دەوڵەت و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی پەیدابووە. هەنووکە، تەنیا رێکخراوگەلی بەمانا ئەوانەن کە بنەمای ئیتنییان هەیە (بەشێوەیەکی سەرەکی کوردی)، مزگەوت (لێ مەرج نییە رادیکاڵ بن)، یان ئەوانەی کە پێوەندییان بە ئەکتەری دەرەکییەوە هەیە وەك ئێران یان حزبوڵڵای لبنان. دەشێ هەوڵ و تەقەلای رادیکاڵانە بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی دەسەڵات بەئاشکرا بێ وەك رابوونی ئەلسەدر، یان بەنهێنی و شاراوە بێ وەك کۆڕوکۆمەڵی خۆجێی بەپشتەوانی دەزگا سیخوڕییە دەرەکییەکان.

لە مەودای کورتـدا، هەڵبـەت هەرەشـەی سـەرەکی، زنجـیرە هێـرش و پـەلاماری ڕێکخراو کە رووی لە زیادبوونـە، بەلایـەنی کەمـەوە لـە سـێ کـەرت و قۆڵـەوە دێ: شوێنکەوتووانی سەدام، ئەو ناسیۆنالیستانەی دژی داگیرکردنی وڵاتن لەلایەن هێزەکانی بیانییەوە، ئیسلامییەکان بـە تیرۆریـست و جـەنگاوەرە بیانییەکانیـشەوە. وێـرای کـە زۆربەی کارە سەرسوڕهێنەکانی تیرۆر لە لایەن موجاهیدە بیانییەکانەوە ئەنجام دەدرێـن، بەتایبەت لەلایەن ئەوانەوە کە سەر بە تۆڕەکانی زەرقاوی-ین، لێ بەعسییەکان چـەقی قورسـایی بەرەنگاربوونـەوە پێکـدێنن. حزبـی بـەعس وەکـو دامەزراوەیـەك و سەرکردایەتییەکەی جارانی، لەباری سیاسییەوە توانای خۆگۆڕین و ریفۆرمیان نییە، لێ ئەگەری ئەوەش هەیە ڕیزو فایلی خۆیـان وا ڕێکبخەنـەوە وەك بەشـداریکاری ئاسـایی پرۆسەی سیاسی. ئەمە سیناریۆیەکی هەرە باشـە، لێ تـا سـاتەوەختی ئـەم نووسینە وێناچێ ئەمە رووبدا. هەروا تەوژمە سەرەکییەکانی سوننە زۆر دوورەپـەرێز کـەوتوون، یان ترسیان لە هاریکاریکردنە لە بنیاتنانەوەی عێراقی نوێ دا.

بەگوێرەی پێکهاتەی گروپە بەرژەوەندخوازەکان و دابەشبوونی هێزە سیاسـییەکان لـە عێراقـدا لەسـاتەوەختی گواسـتنەوەی دەسـەڵات لـە لایـەن دەسـەڵاتەکانی هاوپەیمانانەوە بۆ حکوومەتی کاتیی عێـراق، ئاکـامی هـەرە لـەپێش لـە مـەودای مامناوەندا — لە پێنج ساڵی داهاتوودا - برێتی دەبێ لە رێوشوێنەکانی دەسـەڵات-دابەشکردن لەنێوان کۆڕو کۆمەڵە سەرەکییە ئایینی و نیتنییەکاندا. لـەم ماوەیـەدا، هیچ گروپێك وێناچێ هەندە بەهێز ببێ یان یەکگرتووبێ بشێت و بکارێت باڵ بەسـەر ئەوانی دیکەدا بکێشێت. سیناریۆیەك کە واقیعـی نـەبێت، گەڕانـەوەی حـوکمڕانیی ملهوڕانەی سوننەیە. میراتی درێژخایەنی شەڕ لە عێراق و لابردنی حکوومەتی سەدام برێتییە لە تێکوپێکدانی بنیادی دەسـەڵاتی سوننە کە لە سەردەمی عوسمانلییەکانەوە لە عێراق جێگەی خۆی گرتووە.

**ئەمەش چوار سیناریۆی لێ دەکەوێتەوە:**

1- **دیموکراسی بە خەسڵەتی عێراقییانەوە:** مـۆدێلی دیمـوکراتی پێویـستی بـە بوونی حزبگەلی سیاسیی رکابەر و هەڵبژاردنی ئازادانەی ڕێکوپێك و مـاقوڵ

هەیە، هەروا دەبێ چاوەڕوانی ئەوەش بکرێ پرۆسەی سیاسی کە سەرهەڵدەدا ڕەگ و ریشەی لەناو ئینتمای کەسایەتی، خێڵەکی و ئیتنی بدۆزرێتەوە- وەکو ئێستا لە ناوچە کوردنشینەکاندا وایە لە باکووری عێراق. ئەم مۆدێلەی دیموکراسی وێدەچێ سەرکەوتوو بێ ئەگەر ڕێگە بۆ حوکمڕانییەك بکاتەوە کە نوێنەرایەتییەکی بەرفرەی تێدا بکرێ و توخمەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی سەرهەڵبدەن کە بلۆکی بینای دیموکراسیەتێکی پاك و بێگەردن. سەرباری ئەوەی عێراق تەجرەبەیەکی لەگەڵ دیموکراسیدا نییە، دەکرێ بڵێین ئەم ئەنجامە واقیعییە، لەو رووەوە کە پرۆسەی دیموکراتی دەشێ وەك میکانیزمی کۆکردنەوەو هاوسەنگراگرتنی بەرژەوەندەکانی کۆمیونیتە ناتەباکانی ناو عێراق بەکاربێت. دەستووری کاتی عێراق، کە لە 8ی ئاداری 2004دا مۆرکراوە، وەکو قانوونی بنەڕەتی داڕێژراوە، دەکرێ وەك پردێك بێت بۆ حکوومەتێکی هەڵبژێردراو، نموونەیەکی پۆزەتیڤە بۆ توانای کۆڕو کۆمەڵە ناتەبایە ئایینی و ئیتنییەکانی عێراق کە سازش و سەودا بکەن وەکو پێویستییەك بۆ بەگەرخستنی دیموکراسی.

2- **لبنانی پێش شەڕی ناوخۆ:** ئەمە حکوومەتێکی هەندە دیموکرات یان نوێنەرەوە نابێ وەکو فۆرمۆلەیەك بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی و سوودەکان لەنێوان کۆمەڵە جیا-جیاکاندا. ئاریشەی ئەم سیستەمە نەبوونی نەرم و نیانی و باڵقوڵییە. لە نموونەی لبناندا، سیستەمەکە لە دابینکردنی ئاشتیی دەستەجەمعی و سەقامگیریی سیاسی و نەشونمای ئابووری سەرکەوتوو بوو تا ئەو دەمەی بنەمای دیمۆگرافیی سیستەمەکە، بلانسی خۆی لەدەست نەدابوو. لە لبنان، ناهاوسەنگی لەنێوان دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی و فاکتەرگەلی دیمۆگرافی و ژینگەی نالەباری نێودەوڵەتی بوونە هۆی داڕووخانی سیستەمەکەو شەڕی ئەهلیی لە لبناندا.

3- **لبنانی دوای شەڕی ناوەخۆ:** کۆمەڵەکان بەهۆی فۆرمۆلەیەکەوە بەتوندی لێکهەڵبڕاون، لێ لەناو چوارچێوەی ڤالای تاکە دەوڵەتێکدا. ئەم سیناریۆیە

بگـــره بەناچـــاری ناوبـــژیوانی بیـــانی تێکـــەوتووە لـــە دەوڵـــەتێکی لەبەریەکهەڵوەشـــاوەدا، چ وەکـــو بـــەرەنجامی فاکتـــەرێکی "پاڵپێوەنـــان"- یاریکـــەرە بیانییـــەکان وەدوای فرەوانکردنـــی نفـــووزی خۆیـــان لـــەنێو وڵاتـــدا کەوتوون، چ وەکو فاکتەری "راکێشان"- لاباڵەکانی ناوەخۆ بـۆ بـەهێزکردنی جێ پێی خۆیـان بـەدوای پـشتەوانی بیانیـدا دەگـەڕێن. لـە عیراقێکـی بـە لبنانیکراودا، ئێران دەیەوێ رۆڵێکـی باڵادەسـت لـە باشـووری شیعەنـشیندا بگێرێ، سـوریا لە رۆژئاوا و تورکیا و ئێران دەیانەوێ بەرژەوەندییەکانیان لـە باکووری کوردنشیندا بپارێزن.

4- **لەبەریەکهەڵوەشان:** کۆمەڵەیەکیان، بە زۆری کـورد، چـاویان لـە دەوڵـەتی سـەربەخۆیە. ئەم بەرەنجامە توندوتیژییـەکی گـەورەی لەسـەر کـۆنترۆڵکردنی سەرچاوەکانی داهات لە ناوچە تێکەڵنشینەکاندا، وەدوا دێ. کورد و عەرەب و تورکمان بۆ کۆنترۆڵکردنی شاری کەرکوك و چاڵە نەوتەکانی رکابەرایـەتی یەکتر دەکەن. لەبەر یەکهەڵوەشانی عێراق، بەلایەنی کەمەوە سـێ دەوڵـەتی نابودو پەرپوت و ناتەبا لەسەر سنووری نێوانیـان، لێ دێتـەئارا کـە مایـەی خۆتێکردنی وڵاتە دراوسـێیەکانی لێ دەکەوێتەوە.

بەئەگەرێکی زۆرەوە ئاکامەکە یەکێك دەبـێ لـەو دوو سـیناریۆیە دڵخـوازە، چونکە هەلومەرجەکان لە عیراقدا بـوار بـۆ بـەدیهاتنی لانـی زۆری ئامانجـەکان ناکەنـەوە، کەواتـە، لـە بەرژەوەنـدی کۆمەڵـەکانی عیراقـە رێگەچـارەیەکی سازشکارانە بۆ ئاریشەو کێشەکانی خۆیان لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتوودا ببیننەوە. هەروا ئـەم بۆچـوون و مەزەندەیـە پـشت بـەو شـیکردنەوەیەی ئێمـە دەبەستێ بۆ ئەو سەمت و تەوژمانەی تا رادەیـەك لـەناو زۆرینـەی یـەکگرتووی شیعە و ئەو پێگەیشتنە سیاسییەی تـا رادەیـەك کـوردو شـیعە نیـشانیان داوە، وێرای ناتەبایی سەبارەت هەندێ لایەن و رووی دەستووری عێراقی سەبارەت بـەو دەسەلاتانەی دەبێ لە قەبەڵ ناوچەو هەرێمەکان بکرێ.

هـەر کـام لـە دوو سـیناریۆیەکەی دواییـان، سـیناریۆی هـەرە نیگـەتیڤ دێننەئاراوە ئەگەر یـەکێك لـە گروپـە سـەرەکییەکان زیـاد لەپێویـستچێـی لێ هەڵبېرێ: بۆ نموونە، لە پێشهاتێکی بەدوور زانراوی هەوڵی شیعەکان بۆ هـاوردنی مۆدێلی تیولۆگیی ئێران یـان بـۆ خۆسـەپاندن بەسـەر کۆمەڵـەکانی تـردا، یـان سوننەکان لەوە نێنە خوارەوە کە ئەوان رۆڵـی باڵادەسـتیی مێـژوویی خۆیـان لـە دەوڵەتدا لەدەستداوە، یان بەهۆی هەوڵی کوردان بۆ دەستبەرداربوون لە عێراق.

سەرباری ریسکی لەبەریەکهەڵوەشان کە وەکو لە سـەرەوە باسـکرا، ریـسکی سیاسیی سەرەکی لە عیراقدا بەهێزبوونی هێـزە ئوسـوڵییە ئیـسلامییەکانە، بـە شیعەو سوننەیانەوە، هەڵسوڕاندنی بزووتنەوە شـیعەگەرەکانە لەلایـەن ئێرانـەوە. وەختێکی ئۆپەراسیۆنی سـەربازی لـە عێـراق دەسـتی پێکـرا، ئێـران کۆمـەڵێ بەکرێگیراوی خۆی و هەزاران کادیری عێراقیی پرۆ-ئێرانی خزاندە ناو عێراق(74). هەروا ئێران دەزگای راگەیاندنی وەسای هەیە کە دەنگی خۆی بەشێوەیەکی کـارا بگەیەنێ. باشووری عێراق کە تا رادەیەك هێور بـووە بەبـەراورد لەگـەڵ بـاکوور "سێگۆشەی سوننە" ئەوە نیـشاندەدا کـە ئێـران بەتـەواوی هەسـت بـەوە ناکـا هەرەشەی لەسەر بێ بۆ جولاندنی سەرچاوەکانی خۆی لەناو عێراقدا.

لەتەك ئەوەدا، بەڵگە لەسەر هەوڵ و تەقەلای سعودیە هەیە بـۆ پـەرەدان بـە وەهـابیزم لـەنێو سـوننەکانی بـاکووردا. تێـوەگلانی سـعودیە لـە هـەوڵی ئاوەدانکردنەوەی ناوچە سوننەنشینەکاندا، وەك هەر جێگەیەکی دی، خزمەت بـە رادیکالیزەکردنی وەهابیزم دەکا. وەهابیزم لە سـەردەمی حـوکمڕانیی سـەدامدا، بەنهێنی کاری دەکرد، مزگەوتەکان کە بەنهێنی بەو فیرقەیە بەند بوون، لـە دوای شەڕ رەنگ و رووی راستەقینەی خۆیان وەدەرخستووە(75).

ئەمریکا و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەتوانن چ رۆڵێك وازی بکـەن بـۆ ئـەوەی ئەنجامی هەرە دڵخواز بێتەدی؟ وێـرای بـوونی بەرچـاو و هەسـتپێکراوی سـوپای ئەمریکا و هاوپەیمانان، ئەو ئاکامانەی کە بەهۆی فاکتەرە ناوخۆییەکانەوە دێنـە دیاریکردن تەنیا لە رێگەی بیانییانەوە و لەپەراوێزدا کاریان تێ دەکرێ. بەشداری

هەرە گرنگ کە ئەمریکا تا بتوانێ حکوومەتێکی عێراقی نوێنەرایەتی و جێگیر بهێنێتەدی ئەوەیە کە 1- خۆ لەو کارانە لابدا کە رەوایی لە حکوومەتی عێراق بسێنێتەوە وەك مایەی خۆتێکردن لەو بڕیارانەی کە دەکەونە نێو "ئیختصاص"ی دەسەڵاتگەلی عێراقییەوە، بۆ نموونە، کارو پرسە ئابووری، دارایی، ئیداری و دادوەرییەکان، 2- خۆ لادان لە دەرکەوتن کە پشتەوانی لە گەڕانەوەی بنیادەکانی دەسەڵاتی سوننی بکا یان ئەنتی شیعەیی لە سیاسەتەکانیدا دەرهەق بە حکوومەتی نوێی عیراق و 3- رێگەگرتن لە دەستێوەردانی هێزە دەرەکییەکان بە نەخشەو پلانی دژمنکارانە بۆ سەر دیمۆکراسیی عێراقی، وەك ئێران، سوریا، حزبوڵلا، موجاهیدە سوننییە بیانییەکان.

## کاریگەرییەکان بۆ سەر رۆژهەڵاتی ناوینی هەرەگەورە

کاری دەرهێنانی عێراق لە مەچەکی سەدام وێدەچێ بە "رووداوێکی کارەساتبار" دابندرێ کە شوێنەوارێکی سەرەکی و لەوانەیە یەکلاکەرەوەی لەسەر شکڵگرتنی ئایندەی رۆژهەڵاتی ناوینی هەرەگەورە و پێوەندیی نێوان ئەمریکاو جیهانی موسڵمانەتی هەبێ. زۆرکەس لە جیهانی عەرەبدا شەڕی عێراق بە نسکۆی عەرەب لە 1967 دەبەستنەوە لە رووی کاریگەریی بۆ سەر دڵ و دەروونی عەرەب. بەلایەنی کەمەوە شرۆڤەوانێکی عەرەب ناوی "بومەلەرزە" و "شۆك"ی بۆ ناوچەکە لێناوە[76]. وێرای ئەوەی کە ئۆپۆزیسیۆنێکی بەرفرە لە جیهانی عەرەب و جیهانی موسڵمانەتیدا هەبوو لەبەرانبەر شەڕ لە عێراقدا، لێ زۆر موسڵمانی لیبراڵ، سەمت و ئاقارەکانی دوای سەدامیان بە پۆزەتیڤ دانا. رەوردەوەی ریفۆرمی رژێمە ستەمکارەکان، ئەوان وا بیر دەکەنەوە، ریزەکانی ئەوانی بەهێز کردووە، سەرەڕۆیی ئیسلامی وا سەیر کراوە کە زەوینەی خۆی لەناو خەڵکدا لەدەستداوە لە ئەنجامی هێرش و پەلامارە تیرۆریستەکان لە بالی، کازابلانکا، ریاز و جاکارتا. جێی سەرسوڕمان نییە، تێڕوانینی هەرە پەسندکراوی لەسەر کارلادانی سەدام لە لایەن ئەمریکاوە، چاوەڕوانییە

پڕۆژەتیڤەکانی دیموکراتیزەکردن لە عێراقدا، لە کوێت هەرە بەهێزە کە ببووە قوربانیی دەستدرێژکاریی سەدام. تەنانەت لە میسر ئێمە ئەو تێڕوانینە بەدی دەکەین لەنێو ئەکادیمیکە موسڵمانە لیبراڵەکاندا کە لیبراڵیزەکردنی سیاسی لە عیراقدا بوار لەبەردەم رۆڵی دەوڵەت و ئایین، دیموکراسی، مافەکانی مرۆڤ دەکاتەوە کە ئێستاکە لە جیهانی عەرەبدا وتوێژیان لەسەر ناکرێ[77].

مخابن، زۆر لەو تاودانە سەرەتاییەی گۆڕانکاریی دیموکراتی لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورەتردا، بەهەدەرچوو، کاتێ بەرەنگاری توندوتیژانەی دەسەڵاتی هاوپەیمانان لە ناوچە سوننەنشینەکانی عێراقدا سەریهەڵداو تەشەنەی کردو بووە یاخیبوون. لەماوەی کورتخایەندا، کاردانەوەی نیگەتیڤ لە سەرانسەری جیهانی عەرەب و جیهانی موسڵمانەتیدا بۆ وێنەکانی ململانەی توندوتیژ و بەرکەوتەی لەچارنەهاتووی مەدەنی کە لە ئێستگە سەتەلایتەکانی عەرەبیدا دێنە پێشکێش کردن وەکو جەزیرەو ئەلعەرەبیە، خراپ رەوتارکردن لەگەڵ زیندانییەکانی ئەبو غرێب، وای کرد ئەجێندای ئەمریکا بۆ بە دیموکراتیزەکردنی رۆژهەڵاتی ناوینی هەرەگەورە، بە زەحمەت بێتە جێبەجێ کردن. لە ماوەیەکی مامناوەند تا درێژخایەن، کاریگەری عێراق لەسەر پەرەسەندنی سیاسی لە رۆژهەڵاتی هەرەگەورەی ناوەراستدا پشت بەوە دەبەستێ داخوا سیناریۆی عێراق لەباری مادییەوە چی لێ دەکەوێتەوە. لە سەرێکی دیکەوە، هاتنە ئارای عێراقێکی تا رادەیەك پلورال و جێگیر و دیموکرات تەحەددای هزرو وێناکردنی نیگەتیڤانەیە بۆ رۆڵی ئەمریکا لە ناوچەکەو بنکەی سەرەرۆیان و ئۆتۆکراتان بنکۆڵ دەکا. بەلایەنی کەمەوە، هەندێ شێوەی دیموکراتی دێنێتەئاراوە- کە دەکرێ بگوترێ دیموکراسی بە سیماو خەسڵەتی عیراقییانەوە- کە لە جیهانی عەرەبدا شیاو کردەنی بێ. لەسەرێکی دیکە، ئاکامێکی نەویستراو، ناوچەکە زێتر دەخاتە بەر تەقڵ و شەقڵ و نفووز و متمانە بە ئەمریکا نامێنێ، سیاسەتگەلی سەرچاوەگرتوو لە دیموکراسی بێزێز دەکا و هەلو دەرفەت بۆ پێشیلکاری راوێژکارەکانی ئەمریکا دەکاتەوە لە ناوچەیەکی زیندووی جیهاندا.

بەڕێوەبردنی دوو ئۆپەراسیۆن لە لایەن ئەمریکاوە لە ئەفغانستان و عێراقـدا، دوو دژمنی ئێران: حوکمڕانیی تالیبان و حوکمڕانیی سەدام حوسێنی لابرد. وێڕای ئەوەی کە لەوانەیە تاران بە نەمانی ئەو دوو ڕژێمە کەیفی ساز بووبێ، لێ لەوەش نیگەرانە کە لە دوو سنوورەوە، ئەمریکای هاوسێ بێ و ڕێگەی بۆ کراوەتەوە کـە دەستی بە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەراست بگا. وەکو لەسەرەوە لە وتوویژ لەبارەی ئایندەی عیراق تێبینی کرا، هەلومەرجێکی ناجێگیر لە عیراقدا ڕێگە بە ڕژێمـی ئێران دەدا لە ڕێگەی کرێگرتەو هاوپانەکانی لە عیراقدا پێرەوی نفوزی خۆی بکا. لێ گەشەکردنی دەوڵەتێکی عیراقیی دیموکرات کە تیایدا شیعە دەورێکی گـرنگ و لەوانەیـە نفـووزێکی سیاسـیی باڵادەسـتی هـەبێ، دیـسان ریـسك دەبـێ بـۆ تیۆکراتیی ئێرانی. وەکو مۆدیلی دەوڵەتێکی دیموکراتیی زۆرینە شیعە، زۆر کەس عیراق وەکو مۆدیلێکی زۆر پەسندتری ئەلتەرناتیڤ بۆ مۆدیلی ئێرانی چـاوی لێ دەکەن. دووبارە هاتنەوەئارای شارە پیرۆزەکانی شیعە وەك نەجەف و کەربەلا وەك سەنتەرگەلی ئیسلامیی شیعەی میانەڕۆی هێور دەبنە تەحـەددی بـۆ دەسـەڵاتی ئایینیی ئاخوندەکانی ئێران.

گۆڕانکاری لە ژینگەی تـەناهیی ئێرانـدا لەکاتێکـدا روو دەدەن کـە ڕژێمـی ئێران روبەرووی چـەندین تەحـەددی نـاوەکیی بۆتـەوە، لـە هـەموویان گـرینگتر ئۆپۆزیسیۆنێکی ئەکتیڤی بە ژمارە روو لە زێدەی قوتابیان و خەڵکی گەنجە. ئـەم گۆڕانکارییانە، چەندین بـژاری بـەرفرەی، ئەگـەر مـسۆگەریش نـەبن، لەبـەردەم ئەمریکادا کردۆتەوە بۆ مامەڵـەکردن لەگـەڵ ئێرانـدا لەوەتـەی شۆڕشـی ئێـران روویداوە. ئەم لێوەکۆڵینە ئاماژە بۆ سـێ بـژارە دەکـا: یەکـەمین بـژارە ئەوەیـە چالاکانە ئێران بهێنرێتە ناوەوە، دەبێ ئەوە لە زەیندا هەڵبگیرێ کە ناچـارکردن و دانەخۆرەکردن بەشێوەیەکی بەرانبەر (حصری) نین، ئامانجی ئـەم دانەخۆرەکردنـە ئەوەیە کە ئێران بەشێوەیەکی بنیاتنەرانە بەشداری لە بنیاتنانەوەی ئەفغانستان و عێراقدا بکا (یان واقیعیانەتر، واز لـە بنکـۆڵکردنی پرۆسـەی سیاسـی لـەو دوو وڵاتە بهێنێ). بژاری دووەم ئەوەیـە کـە ئـەمریکا بـەردەوام بـێ لەسـەر وەتـاق

خستنەوەی تاران تا ئەو دەمەی رەوتاری ئێران دەگۆڕێ لەمەڕ پشتەوانیکردنی تیرۆریزم، بڵاوکردنەوەی چەکی کۆکوژ، مافەکانی مرۆڤ و دیموکراتیزەکردن. سێیەم ئەمریکا وەدوای دنەدانی گۆڕانی رژێم بکەوێ. هەر سیاسەتێك بگیرێتەبەر، دەبێ لەهەلومەرجێکی زۆر نامسۆگەردا بەرێوەببردرێ. ئێران وڵاتێکە بە زەحمەت دەخوێندرێتەوە لەسایەی هەلومەرجی ئاسایدا. لەگەڵ تەوژمی ئەو رووداوانەی روویانداوە لە دوای پەلامارە تیرۆریستییەکانی 2001-دوە، خوێندنەوەی ناخ و مەرام و تێگەیشتن لە بەلانسی هێزەکان لەنێو ئەو وڵاتەدا، زۆر بەزەحمەت کەوتووە.

وەدەسەڵاتکەوتنی شیعە لە عیراقدا، هەروا مانای قووڵی بۆ ئایندەی عەرەبستانی سعودی هەیە. وەکو پێشتر سەرنجدرا، شیعەکان کەمینەیەکی بەرچاو لەوانەیە تەنانەت زۆرینەی ئوستانە پڕ نەوتەکانی شانشینی سعودی پێکبهێنن. بەماوەیەکی کورت دوای دەسپێکردنی شەڕی عێراق، سەرکردە شیعەکانی عەرەبستانی سعودی سکاڵایەکیان دایە خاوەن شکۆ مەلیك عەبدوڵڵا سەبارەت بە مافی وەکیەکی سیاسی و ئایینی. موفتی سەرەکیی شانشین، شێخ عەبدولعەزیز بن عەبدوڵڵا ئەلشێخ، رایگەیاند کە تاوانبارکردنی موسڵمانانی دی بە ناباوەڕی —تۆمەتی باوی وەهابییەکان دەرهەق بە شیعەکان- لەسایەی ئیسلامدا رێگەی پێ نادرێ. بەهەرحاڵ، روون نییە داخۆ رێبازی لێبوردەیی پشتەوانییەکی فرەوانی لێ دەکرێ لەناو دامەزراوەی ئایینیی عەرەبستانی سعودیدا. لە پێڤاژۆیەکی بەرفرەتری جیوپۆلەتیکدا، هەندێ لە سوننەکانی عەرەبستانی سعودی ترسیان لەوە هەیە کە سیاسەتی ئەمریکا لە عیراق و لە کەنداو بە "قازانجی شیعە" بکەوێتەوەو ببێ بەمایەی پشتەوانی ئەمریکا بۆ ئاواتی شیعەکان لە دەوڵەتگەلێکی سوننە باڵادەستدا[78].

هەروا دەردەکەوێ وتوێژێکی بەرفرە لەناو عەرەبستانی سعودیەدا هەیە کە داخوا نا-لێبوردەیی و فاناتیزم کە وەهابییەکان دنەی دەدەن نەبووەتە هۆکارێکی رادیکاڵبوونی هەندێ کەرت و توێژی کۆمەڵگە. لەم بارەوە، بەردوسەرچوونی پەلامارە تیرۆریستییەکان لە عەرەبستانی سعودی کە لە 12ی ئایاری 2003

دەستیپێکرد، پەلامارەکانی ریاز کە رووداوی کارەسات بوون بۆ سعودیە، سعودییەکانی هێناوەتە سەر ئەو باوەڕە کە "ئەو شتانەی لە خەڵکی دیکەش قەوماوە"، دەستی بیانیان لەپشتەوەدیە، ئاماژە بۆ پەلامارەکانی ریاز دەکەن وەك "11ی سپتێمبەری ئێمە". گۆشەنووسێکی سعودی، بەراشکاوانە گوتی کە وەهابیزم لە شانشین بڵاوبۆتەوە لە رێگەی پرۆگرامەکانی قوتابخانە، رێورەسمەکانی مزگەوت، تەلەفزیۆنەکانی دەوڵەت هۆی ریشەیی میلشیای ئیسلامین"[79].

رووخانی سەدام حوسێن و بوونی بەردەوامی سەربازیی ئەمریکا لە عیراق، سوریای دراوسێی لەناکاو گۆڕی. وێرای کە حزبی بەعس هێشتا ماوەتەوەو خۆی راگرتووە، لێ نیشانەی گۆڕانیش وەدەرکەوتووە. راست لەدوای شەڕی عێراقەوە، حکومەتی دیمەشق چەندین هەنگاوی بەئاراستەی ریفۆرم هەڵێناوەتەوە لەوانە (نا میلیتارەکردنەوەی) قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندییەکان، کردنەوەی سێ بانکی تایبەت، موسادەقەکردن لەسەر دوو زانکۆی تایبەت و چوار ئێزگەی رادیۆ، ئەگەری ئەوەش هەیە ئەو بڕیارەش هەڵبوەشێنرێتەوە سەبارەت بەوەی کە دەبێ سەرجەم قوتابیان بچنە ناو کۆڕو کۆمەڵەی گەنجانی سەر بە بەعس[80]. سەرباری ئەوەش، 287 روناکبیر و هەڵسوڕاوی سوریا سکاڵانامەیەکیان بە ئەسەد داوە سەبارەت بە ئازادکردنی زیندانییە سیاسییەکان، هەڵوەشاندنەوەی قانوونی عورفی، ئازادیی رادەربڕین و چالاکی سیاسی. پەرەگرافەکانی سەرەتایی سکاڵانامەکە بەڵگە بۆ ئەوە دێننەوە کە واقیعییەتە ستراتیجییەکانی سوریا گۆڕاون، ناکرێ پێش لە "بێ قانوونییەکان"ی ئەمریکا بگیرێ، ئەگەر رژێمەکانی عەرەب "پەڕپوت یان هەرەس بێنن"، سوریا ناکرێ خۆی بۆ خەتەرێکی بەرچاو بەبێ گرتنەبەری ریفۆرمی نیشتمانی ئامادە بکا[81].

شەڕ لە عیراقدا، پێوەندییەکانی ئەمریکا- تورکیای گرژ کرد، لێ ئەو گرژییەی لەسەرەتای شەڕەکەوە دروست ببوو، تا رادەیەکی زۆر خاوکراوەتەوە. نەتوانینی ئەمریکا بۆ بەکارهێنان و زامنکردنی موافەقەی تورکی بۆ بەکارهێنانی هێزەکانی ئەمریکا و بنکەی ئاسمانیی ئەنجەرلیك بۆ کردەوەکانی لە

کاتی شـەڕدا، ڕەنگدانـەوەی ژینگـەی گـۆڕاوی سیاسـیی تورکیایـە. سیاسـەتی دەرەکیی و تەناهیی تورکی، بەشێوەیەکی نەریتی لە لایەن هەندێ توێژو کەرتەوە بـەڕێوەدەبردرێ، لەوانـە هەیئـەی ئـەرکانی سـوپا، بیرۆکراتـە سـەرەکییەکان، ژمارەیـەکی کـەمی بیرمەنـدە سـتراتیجییەکان. لـە سـەرەتای نۆهەتەکانـەوە، بەهەرحاڵ، پەرەگرتنی ئیسلامی سیاسی و کشانەوەی دەوڵەتی عەلمانی لە هەندێ پانتایی ژیانی تورکیا، ڕووبەری تازەی بۆ کاریگەریی نوخبەیـەکی ئەلتـەرناتیڤی کـەم عـەلمانیتر، زۆر کۆنـەپارێزتر، زۆر تەسـکبینتر، کـردەوە. هاتنەسـەرکاری حزبێکـی ڕەگ و ریـشە ئیـسلامی وەك حزبـی دادو گەشـەپێدان، ئـەم تـەوژم و سەمتانەی تاو پێدا و خێراکرد.

شیکردنەوەی ئێمە نیشانی دەدا کە سەرەڕۆیی ئیـسلامی هەڕەشـە نییـە بـۆ سەقامگیری لە تورکیا. لەوەتەی پـارتی دادو گەشـەپێدان لـە سـاڵی 2002-ەوە هاتۆتەسەرکار، پێوەندیی نزیکی لەگەڵ نوخبە عەلمانییەکاندا هـەبووە تـا پارتـە ئیسلامییەکانی جاران. لەبری لایەنگیریی ئـاین لـە سیاسـەتدا، ڕەجـەب تـەیب ئەردۆگان-ی سەرۆکوەزیران پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە "سیاسـەت زامنی ئـاین دەربڕینـە"[82]. وێناچـێ "خەتـە سـوورەکان"- "پاراسـتنی یـەکێتیی خـاك و عەلمانیبوونی دەوڵـەت" ببەزێنـدرێ. لـەبواری سیاسـەتی دەرەکـی و تەناهیـدا، جیهانبینیی ئەو حزبە بریتییە لە بەردەوامبوونی ڕەوتاری تـورکی، کـە بەرهـەمی کۆنزەرڤاتیزمی ئوسوڵییە لە ڕێبازی تورکیادا. بەهـەر بارێـك، خۆبەسـتنەوە بـە هاریکاری بە بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم هەروەکو خۆی پتەو و بەهێزە.

تاقیکردنەوەی تورکیا لە سازاندنی دینداریيەکی گەورەتر لـە سیاسـەتەکاندا لەکاتێکدا دەوڵەت بەعەلمانی و سەروسەمتی ڕۆژئـاوایی خـۆی بهێنێتـەوە مانـاو نێـوەڕۆکێکی سەرنجڕاکێـشی بـۆ ئایـندەی ئیـسلامی سیاسـی هەیـە. ئەگـەر سەربکەوێ، ئاقارو مەودای ئیسلامی لیبراڵـی فـرەوانتر دەبـێ. لەهەمانکاتـدا، وەکو Ian Lesser لە فەسڵی سـێیەمدا وریـایی دەدا، ئایـندەی تورکیـا بـەهیچ شێوازو وەسیلەیەك نا بەگوێرەی ئەم هێڵە دەورێتەوەو ئارام دەکرێ و دەڕوا. زیـاد

لەوەش کلیلەکە لە مۆدیلی تورکیادا دەگۆڕێ، "تکامل"ی تورکیا لە یەکێتیی ئەورووپی و لەناو رۆژئاوا، لە زۆربەی بارەکانی تێردا بوونی نییە کە ئیسلامی سیاسی ملە بۆ گەیشتنە دەسەڵات دەکا.

## کاریگەرییەکانی لە جیهانی موسڵمانەتیدا

کاریگەریی شەڕ لە عیراق و لابردنی رژێمی سەدام حوسێن لەو ناوچانەی جیهانی موسڵمانەتی سووکتر بوو کە لە باری جیوگرافی و کولتوورییەوە لە رۆژهەڵاتی ناوین دوور بوون. شەڕ لە عیراق بەتوندی لە ئاسیای ناوەڕاستدا دەنگی نەدایەوە. بۆ کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست، رووداوی سەرەکی لە سەردەمی دوای 11ی سپتێمبەر بریتی بوو لە شەریکایەتی حکوومەتەکانی ناوچەکە لەگەڵ ئەمریکا و رووخاندنی رژێمی تالیبان. لەسەرکار لادانی تالیبان ئەو هەڕەشەو سەرئێشەیەی کە تالیبان بۆ حکوومەتەکانی ئاسیای ناوەڕاستی دروستکردبوو و بەر دەرگای پێگرتبوون، نەما. جگە لە کەمینەیەکی گچکەی چەکدار، زۆرینەی موسڵمانان لە ئاسیای ناوەراستدا لێکدانەوەی تالیبانیان بۆ ئیسلام پێ پەسند نەبوو.

بەشی هەرە زۆری، کەرت و توێژە سەرەکییەکانی موسڵمانان لە باشوورو باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دژی شەڕ بوون لە عیراق، لێ وانەبوو شەڕەکە کاریگەریی درێژخایەن لەسەر نەشونمای ئیسلامی سیاسی یان لەسەر پێوەندیی ئەمریکا بە دەوڵەتەکانی ناوچەکە جێبهێڵێ. حکوومەتی مالیزیا، وەکو سەرۆکی بزووتنەوەی بێلایەن دژایەتی شەڕی ساز دەدا بەبێ سزای یوئێن، پەرلەمانی مالیزیا بەکۆی دەنگ پێشنیارێکی وەرگرت سەبارەت بە تاوانبارکردنی کاری یەکلایەنە دژ بە عیراق[83]. خۆنیشاندنی گەورە-گەورەی دژ بە شەڕ لە ئەندەنووسیای وڵاتی زۆربەی موسڵمانانی ناوچەکە کران، لەو رۆژانەی کە کاری دژمنکارانە دەستی پێکرا و لە دوو حەفتەی یەکەمی شەڕدا. لێ ژمارەو قەوارەی ئەو خۆنیشاندانانە بەشێوەیەکی بەرچاو کەمبووەوە دوای ئەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان چوونە ناو بەغدا.

ئەم کاردانەوە بەرێژە هێورە بۆ چەندین هۆکـار دەگەڕێتـەوە، حکوومـەتان و سـەرکردە میـانڕەوە موسـڵمانەکان هـەم ناردزایەتییـەکانیان ڕێکخـستبوو هـەم کۆنترۆڵیان کردبوون وەکو لە مالیزیا یان هەنگاوگەلی بـەپارێزیان وەرگرتبـوو بـۆ دڵنیابوون کە شەرەکە لە عیراقدا ئاراستەی ئیسلام نەکراوە وەکو رادیکاڵەکان بە هەنـدێ پلـەوە کردیـان لــە نموونــەی ئەفغانــستاندا. دووەم لــە ئەندەنووســیا، کەشوهەوای گۆڕاوی سیاسی لە دوای تەقینەوە تیرۆریستییەکانی بـالی لـە 12ی ئۆکتۆبەری 2002دا وایکرد کە کاری جەماوەرییانەی رادیکاڵەکان کەمتر پەسـند بکرێ. سێیەم هاوسۆزییەکی کەم لەنێو موسڵمانەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لەگەڵ سەدامدا هەبوو. تەنانەت بەرهەڵستکارانی شەڕ دانیان بـەوە دا دەنـا کـە سەدام حوسێن سـتەمکارە و لــە روانگــەی هەنـدێ لـە موسڵمانانیـشەوە وەکـو سەرکردەیەکی نا ئیسلامی چاوی لێ دەکرا کـە شـایانی ئـەوە نییـە موسـڵمانان پشتەوانی لێ بکەن. چوارەم جەماوەر بەشێوەیەکی رەها لەبەر پرسگەلی نـاوەکی یاری بە دۆزی نێودەوڵەتی کراوە.

ئەمە بەو مانایە نییە کە شەڕ لە عیراق هۆکارێکی نوێ و ئـاڵۆزی نەهێنایـە ئارا بۆ ناو شەڕی دژ بە تیرۆریزم یان کاریگەرییـەکی نالـەبارو چـەوتی بـۆ سـەر تێگەیشتن لە ئەمریکای نەبووە. ئەم تێگەیشتنانە چەوتتر بوون، کاتێ تیرۆریزم و کـاری توندوتیـژ لــە عیراقــدا پــەرەیان ســەند و هــەوڵ و تەقــەلای هێزەکـانی هاوپەیمانانیش بۆ کۆنترۆڵکردنی رەوشەکە لە میدیای دژمنکاردا وەکو شالاوی دژ بە ئیسلام نیشاندرا. بەڵگەی دەگمەن بەدەستەوەیە، بۆ نوونە، کە عیراق بووەتـە هۆکارێکی سازدان و مۆبالیزەکردن و ئەمەش لەو کارە توندوتیژانەی ئەم دواییـە پەرگیرە ئیسلامییەکان لە خوارووی تایلاند ئەنجامیانـدا، دەردەکـەوێ. لـە بـیرو زەینی سەرەڕۆیاندا، جەورو ستەم لەسەر ئاستی نێودەوڵـەتی و ناوچـەیی بووەتـە یەك[84]. ئیدی، لەکاتێکدا شەڕ بۆ خۆی و پەرەگرتنەکانی بەرودوای شەڕ خەت و میلـی سیاسـی سـەرەکییان نـەگۆڕی لـە دەرەوەی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت یـان ئەساسیاتی پێوەندییەکانی ئەمریکا لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچەکە، دەکرێ شـەڕ لـە

لایەن رادیکاڵەکانەوە بەکار بهێندریٚ بۆ نفووزپەیداکردن و بەکاریشیان هێناوە. بەهەرحاڵ کەمینەیەکی لیبراڵ لەگەڵ ئاواتەکانی ئەمریکا بووە، کە لابردنی سەدام حوسێن ئەگەرێك بۆ نەشونمای دیموکراتی لە عیراق و جیهانی موسڵمانەتی بەگشتی دەکاتەوە.

### دەرەنجام و راسپاردەکان

ئەمریکا چۆن وەلامی تەحەددیاتەکان و هەل و دەرفەتەکان لە جیهانی موسڵمانەتی دەداتەوە؟ ناکریٚ تەنیا بە دەستاوێژی سوپایی شەڕی سەرەڕۆیان بکریٚ. دەبیٚ لە رووی کولتووری و کۆمەڵایەتیشەوە بەربەرەکانیٚ بکرێن. لە خوارەوە ئێمە پێشنیاری چەند بژارێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی و سەربازی دەکەین.

### پتەوکردنی پێکهاتەی تۆڕە میانڕەوەکان

ئەو خەبات و ململانێیەی لە زۆرێك لە جیهانی موسڵمانەتیدا بەڕێوەدەچیٚ، پێکدادانی شارستانێتییەکان نییە، بەڵکە خەبات و ململانێیەکە لەناو هەناوی جیهانی موسڵمانەتیدا لەنێوان تەوژمگەلی ئیسلامی لیبراڵ و عەلمانیەت لە لایەك و لێکدانەوەی توندوتیژو رادیکاڵانە لەلایەکی ترەوە. رادیکاڵەکان کەمینەن، لیٚ لە گەلێك ناوچەدا، داشیان سوارە، چونکە تۆڕگەلێکی فراوانیان پێکهێناوە لە سەرانسەری جیهانی موسڵمانەتی و هەندیٚ جاریش لەو دیو ئەم جیهانەشدا. راستە موسڵمانە هێورو لیبراڵەکان، بگرە لە هەموو وڵاتاندا زۆرینەن، بەڵام تۆڕگەلێکی هاوشێوەیان دروست نەکردووە. بەلایەنی زۆرەوە، موسڵمانە میانڕۆیەکان هەست بە گۆشەگیری دەکەن و کراون بەئامانج. دەنگ و سەدایان نییە یان کپ و بیٚ دەنگ کراون. ئەوەی لە چەندین وڵاتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەیبیستین ئەوەیە کە خەبات و نەبەرد بۆ ئیسلام پێویستی بە پێکهێنانی کۆڕو کۆمەڵەی لیبراڵ هەیە، بۆ قورتارکردنی ئیسلام لە زەوتکەرانی ناپین. پێکهێنانی تۆڕی نێودەوڵەتیی بۆ میانڕەوان، کارێکی یەکلاکەرەوەیە چونکە تۆڕێکی وەسا پلاتفۆرمێك دەدا بۆ پەخشکردنی پەیامی خۆیان و هەندیٚ

